ناوی کتێب: بیرەوەری مێژوویی لە تێڕوانینی کوردێکی نەتەوەیی
بەرامبەر بە شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١
بابەت: یادەوەریی مێژوویی
نووسەر: تۆفیق نوری بەگ (ناوی نهێنی: سەرکەوت بابانی)
تایپ و سەرپەرشتیار: زانا تۆفیق بەگ
هەڵەچن: هێمن حسێن
نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: نەیڤان ساڵەح
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٢٠
چاپ: چاپخانەی تاران
تیراژ: ١٠٠٠
نرخ: ٦٠٠٠ دینار
لە بەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ) ی ساڵی ٢٠٢٠ی پێدراوە

# ناوەرۆک

## پێشەکی:

### خوێنەری بەڕێز

ئەم بەرهەمەی بەردەستان پەرتوکێکە لە ساڵی ١٩٧٨ بە پێنووسی شەهید (توفیق نوری بەگ)نووسراوە، بەڵام دەستنووسی یەکەمی فەوتاوەو جارێکی تر نووسەر لە ساڵی ١٩٨٨ دووبارە نووسیویەتەوە، پەرتووکەکە باس لە مێژووی نەتەوەکەمان و ئەو ڕووداوانەش دەکات کە خۆی تیای بووە، بەتایبەتی قۆناخەکانی دروستبوونی کورد پاشان شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی گەلی کورد لە قۆناغە جیاوازەکاندا. ئەم دەستنووسە بەداخەوە لە پاش تەواوبوونی ناوبراو شەهید دەکرێت، ناگات بەوەی کە چاپ و بڵاوبیکاتەوە، بەڵام لای ئێمە وەکو بنەماڵەکەی پارێزاو بوو. چەند جارێک لە دوای شەهید بوونی هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئەم پەرتووکەماندا، بەڵام بەهۆی ژیانی تاراوگەو دوورێیمان لە کوردستان نەمانتوانی بەچاپی بگەیەنین، بەڵام هەمیشە لە هەوڵی ئەودا بووین لە دەرفەتێکی گونجاودا خەونی شەهید بە دیبهێنین . چونکە ئەم پەرتووکە جگە لەوەی باس لە کۆمەڵێ قۆناغی جیاوازی شۆڕش دەکات، هاوکات لێکۆڵینەوەیەکی واقیعی ئەکادیمیشە، کە پشتی بە کۆمەڵێ سەرچاوەی زانستی مێژووی بەستووە بۆ زیاتر دەرخستنی ڕووی ڕاستی شۆڕش و سەرکردەکانی ئەوکاتەی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کورد و ئامانج تەنها دەرخستنی واقیعی ئەوکاتەی شۆڕشی کورد بووە. بۆچوونەکانی نووسەر زیاتر بریتی بووە لە ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەو کەم وکوڕیانەی

شۆڕش نەک ناوزڕاندنی هیچ کەس و لایەنێک کە بە ئامانجی تایبەتی یان کەسی نووسرا بێت.

**بەڕێزان**

هەرچەندە چاپکردنی ئەم پەرتووکە بە کۆمەڵی قۆناغی قورس و گراندا تێپەڕی، ئەوەش بەهۆی کۆنی دەست نووسەکە و هەڵگرتنی بۆ ماوەی زیاتر لە ٣٠ ساڵ، بەڵام بەهیمەتی دڵسۆزان و هاوبیرانی شەهید(توفیق نوری بەگ) توانرا بەسەر هەموو ئەو کۆسپ و تەگەرانەدا زاڵ بین، کە لەکاتی پێداچوونەوە هەڵچنین توشی دەبووین، بۆیە لێرەدا بە پێویستی دەزانم سەرەتا داوای لێبوردن لەو کەسایەتیانە بکەم کە شەهید لەناو پەرتووکەیدا ناوەکانیانی وەکو ڕەمز نووسیوە بە مەبەستی ئاشکرا نەبوونی ناوەکانیان لەکاتی ڕژێمدا، هەرچەندە بەندە بەدواداچوونێکی زۆرم بۆ بەشێکیان کردو دۆزرانەوە، بەڵام بەداخەوە هەندێکیان نەمانتوانی ناوەکان بدۆزینەوە کە کێن ئەو بەڕێزانە، هاوکات گرنگە کە سوپاسی برای ئازیزو خۆشەویست کاک (هێمن حسێن) بکەم کە ئەرکی پێداچوونەوەی گرتە ئەستۆی خۆی بەشێوازێکی زۆر وردو شارەزایەنەو دڵسۆزانە کەموکوڕییەکانی ئەم پەرتوکەی چارەسەرکرد. ئێستا توانیمان جارێکی ترخەونی شەهید بێنینەدی و دەستنووسەکەی لەدووتوێی ئەم کتێبەکەدا چاپ و بڵاوبکەینەوە. داواکارم لە خوێنەرانی ئەم کتێبە لە کەم کوڕیمان ببورن ئەگەر لە شوێنێکدا هەڵەیەک کرا بێت یان نەمتوانی بێت هەندی بابەت بگەینە سەرچاوەکەی. لەم کتێبەدا وەکو خۆی و بە ئەمانەتەوە

نوسیومانەتەوەو چاپمانکردوە بێ دەستکاری، هەرچەند لە هەندێ شوێن و وشەدا پێویست بوو کە دەستکاری بکرێت، بەڵام ئێمە وەک ئەمانەتێک ویستمان وەک خۆی دایبنێینەوەو دەستکاری هیچ ووشەو مانایەکی نەکەین. دەمەوێت دووبارە سوپاس و پێزانینی خۆمان بۆ هەموو ئەو کەسایەتیانەی دەرببڕم کە توانیان هاوکارمان بن لە چاپکردنی ئەم پەرتووکەدا. لە کۆتایدا سەری ڕێزو وەفاداری بۆ شەهیدی دەستی غەدر (توفیق نوری بەگ) و سەرجەم شەهیدانی بیری نەتەوەیی لەسەر فەلسەفەی کوردایەتی نین. هیوادارم کە رۆحی شەهید ئاسودە بێت رێزو پێزانین قەدر گران قبوڵ بفەرموون.

**کوڕی شەهید**

**زانا توفیق نوری بەگ**

**جاری یەکەم ئەم بیرەوەرییەم لە ساڵی ١٩٧٨دا نووسی**

**بەڵام فەوتاو بۆ جاری دووەم ساڵی ١٩٨٨-١٩٨٩ نووسیمەوە**

**ئەم بیرەوەرییە پێشەکەش بە...**

- گیانی پاک و پیرۆزی ئەو شەهیدانەی بۆ پاراستنی قەوارەی نەتەوەیی و کوێرنەبوونەوەی ناوی کوردستان، هەروەها بۆ پارێزگاری لە ئابڕووی کورد گیانی پاکی خۆیان بەخشی.

- بەو کوردە نەتەوەیی و خاوەن بڕوایانەی کە بە نان و جلوبەرگی خۆیان، بە تواناو لێهاتوویی خۆیان و بێ گوێدانە ماندووبوون خزمەتی کوردو کوردستانیان کردووە، هەروەها پێشکەشە بەو کەسانەی بۆ پتەوکردن و بەهێزبوونی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١، کە بێ چاوەڕێکردنی پاداشت و ئافەرین و دەستکەوتی تایبەتی بۆ کوردو کوردستان خەباتیان کرد.

- بەو کەسە نەتەوەییانەی کە بۆ ئازادیی کوردو یەککرتنەوەی کوردستانی گەورە، بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتێکی خۆماڵیی کوردی، پێشکەشە بە هاوبیرانی ئازاو نەبەزو لێهاتووی (کاژیک و پاسۆک).

- بە باوکی دڵسۆزو کوردپەروەرم، کە بەهۆی گێڕانەوەی بەسەرهات و ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەی ئەوانەوە، بە هەڵەو هۆیەکانی ژێرکەوتن و دواکەوتنی نەتەوەکەمان شارەزا دەبووین، چونکە زانیارییەکانی ئەو هاندەرمان بوو بۆ کوردایەتی و پشتبەستن بە نەتەوەو نیشتمان، هاوکات دوورنەکەوتنەوەمان لە کوردو کوردستان.

## سەرەتا

خوێنەری هێژا...

نووسینەوەی ڕووداوە مێژووییەکان لە هەموو ڕووەکانی (سیاسی، کۆمەڵایەتی، فکری، ڕۆشنبیری، سەربازی، ئابووری، شۆڕشگێڕی، پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان)، پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە ژیانی نەتەوەو نیشتمانەوە هەیە. پێویستە لەبەر ڕۆشنایی ڕاستییەکان و بەگوێرەی واقیعی ئەو ڕووداوانە بن، هەروەها دوور نەکەوینەوە لە بیروڕاو بارودۆخ و کاتی ئەو ڕووداوانە، چونکە ئەگەر بەمجۆرە نەبوو، ئەوا مانای ڕیزکردن و نووسینەوەی چەند درۆو دەلەسەیەکی ناڕاستی و ناواقیعی دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێتە هۆی سەرلێشواندن لە نەتەوەکەمان و فریودان و شێواندن و ئاڵۆزکردنی مەبەستەکان، هەروەها دەشبێتە تێنەگەیاندن و ڕێگا لێونکردنی خوێنەرو نەوەی داهاتووی میللەتەکەمان.

ئەگەر بەپێچەوانەوە بوو، ئەوا زیانێکی گەورەش دەدەین لە مێژووی کوردو تاریککردنی ڕێگای بەدەستهێنانی ئامانج و بەختەوەریی بۆ نەوەکانی داهاتووی گەلەکەمان. پێچەوانە نیشاندانی ڕووداوەکان، بە ئاوەژووکردنەوەی ڕووداوەکان، زیاتر بەرەو هەڵدێرو نائومێدیی و ڕەنجەڕۆییمان دەبەن، چونکە بەمجۆرە نەوەی نوێ سوود وەرناگرێت لەو هەڵانەی کە بوونەتە هۆی ژێردەستەیی و دابەشکردنی کوردو کوردستان، دەشبێتە مانەوەی بەمجۆرەی ئێستای، کە ڕێگای ئازادی و سەربەخۆیی و یەکگرتنەوەی تێدا ونکراوە.

پێویستە لە نووسینەوەی ئەو بیرەوەرییە مێژووییانەدا،

هەمیشە مەبەست ڕاستکردنەوەی ڕێڕەو و بیروڕای بێکەڵک بێت. دوورخستنەوەی ڕۆڵی نەتەوەکەمان لەو واقیعە سەپێنراوەی داگیرکەرو دوژمن، کە لە هەموو ڕوویەکەوە سەپاندوویانە بەسەریدا. دەبێت مەبەست لە نووسینەوەی ڕووداوە مێژووییەکان بۆ تێگەیاندن و پێگەیاندن و هۆشیارکردنەوەی نەتەوەکەمان بێت. بۆ دۆزینەوەی ڕاستیی مەسەلەی باردۆخی نەتەوەو نیشتمان بێت. بۆ هاندان و زیندووکردنەوەی گیانی کارو کردەوەی بەکەڵک بێت. بۆ نەخشەکێشان و بیرکردنەوە لە هەڵبژاردنی ئەو بیروباوەڕە ڕاستییە بێت، لە هەموو ڕوویەکی ژیانەوە کە نەتەوەو نیشتمان دەگەیەننە ئامانجە مێژوویی و هەقە شایستەکانی خۆی.

دەبێت نووسینەکان بۆ دووبارە نەبوونەوەی ئەو نالەباریی و کردەوە بێسودانە بێت کە بوونەتە هۆی چەوساندنەوەو ژێردەستەیی داگیرکراوی خاک و نەتەوەکەمان، دەبێت هاندەری بەهێزکردنی تواناو هێزمان بێت بۆ مەبەست و بەرژەوەندییە گشتییەکانی نەتەوەو نیشتمانەکەمان.

لە نووسینەوەی ڕووداوە مێژووییەکاندا نابێت بەگومان و دوودڵی و بێ بڕواییەوە بنووسین، دەبێت بە ئاشکراو بێ پێچ و پەنا بنووسین. دەبێت بیر لەوە نەکەینەوە کە لە نووسینەکانماندا کەسێک، یان فڵان پارت و کۆمەڵە پەست و دڵگران دەبن. یان بەرژەوەندی لەوەدایە باسی ڕاستییەکان نەکەین، پەردە دانان بەسەر ڕاستی و ڕووداوەکان و بە پێچەوانە باسکردنیان، تاوانێکی گەورەیە دژی نەتەوەو نیشتمان. دەبێت ئەوەی بڕوامان پێیەتی و بەڕاستی دەزانین، بەڕاستی باسی بکەین، نابێت هیچ کارو کردەوەو ڕووداوێک لە شک و گوماندا بهێڵینەوە.

نووسەرانی نەتەوەکانی دونیا لە نووسینەوەی ڕووداوە مێژووییەکانیاندا بەدڵنیایی و بڕوایەکی تەواوەوە ڕووداوەکان باس دەکەن و لەسەری دەنووسن و دەشیسەلمێنن، کەچی بەداخەوە نووسەرانی کورد کارو کردەوە بەکەڵک و مێژووییەکانی خۆمان بەجۆرێک باس دەکەن و دەنووسن، خوێنەر دەخەنە شک و گومانەوە، بەرامبەر ئەو بەسەرهات و ڕووداوە مێژووییانە. نووسەرەکانی کورد زۆر وشە بەکاردەهێنن، وەکو (ئەگەر وەهابووین، یان ئەگەر وابێت، یان وەکو دەڵێن، یان ئەگەر ئەمە ڕاست بێت... هتد)! ئا لەم بابەتانەی کە ڕووداوەکانی مێژوویی خۆمان بەڕەوا نازانین بۆ خۆمان، بۆیە زۆربەی بووە بە موڵکی بێگانە، ئەوەش بۆ کوردو بۆ بێگانەش سەلمێنراوە.

کەواتە پێویستە ڕووداوە مێژووییەکانی خۆمان نرخ و شکۆیان هەبێت لەلامان، وەکو مافێکی ڕەوا هی خۆمان بۆ خۆمان بێت بیسەلمێنن. ئێمەش خاوەنی ڕابردوو و بەسەرهاتی گەورەو گرنگی مێژوویین و کارو کردەوەی بەسوودمان هەبووە. لێهاتنی بەتوانا شانبەشانی ڕوونکردنەوەی ئەو کردەوە بێ سوودانەی کە بەهۆی دەستتێوەردان و پیلانی داگیرکەرو نۆکەرانی تووشی نەتەوەکەمان بووە. پێویستە نووسەرانی کورد ئەو ڕاستییانە لە کورد بگەیەنن کە بەڕاستی کوردستان داگیرکراو و بەش بەش کراوە. نەتەوەی کوردیش ژێردەستەو چەوساوەو برسی و زووڵملێکراوە. پێویستە ئەو ڕاستییە لە کورد نەشارنەوە کە ئەو نەتەوەو ڕژێمەی ئاڵای بەسەر کوردستانەوە دەشەکێتەوە، زمانەکەی زمانی فەرمی کوردەو سکەو پارەی لە کوردستاندا مامەڵەی پێوە دەکرێت. دەستی

بەسەر سامان و خێروبێری کوردستاندا گرتووەو فەرمانڕەوایە لە کوردستاندا، ئەوە داگیرکەرەو دووژمنی نەتەوەو نیشتمانەکەمانە.

پێویستە نووسینەکانی نووسەرانی کورد سەرمەشق بن بۆ بەهێزکردنی گیانی نیشتمانپەروەریی و نەتەوەییمان. دەبێت نووسەرەکانی کورد لە نووسینەوەی بیرەوەریی و ڕووداوە مێژووییەکانی کورد ئەوە بزانن، کە باسی زانستێک دەکەن لە ڕاستییەکانی نەتەوەکەمانەوە سەریانهەڵداوە. ئەگەر بەم شێوەیە ڕووداوە مێژووییەکانمان نەنووسییەوە، ئەوا نووسینەکانمان وەکو نووسینی نووسەرانی داگیرکەرو دوژمنانی لێدەردەچێت، کە بەپێی سودو بەرژەوەندی خۆیان دەنووسن. لەبەر ڕۆشنایی بیروڕاو مەبەستی مانەوەی کورد بەژێردەستەیان دەنووسن، یان ئەوەی لەناوبردنی کورد بەوجۆرەی کە بەشێکە لە نەتەوەی داگیرکەر، کوردستانیش بووە بە بەشێک لە نیشتمانی داگیرکەران و بەمجۆرەش پیشانی دەدەن. کەواتە دەبێت لە نووسینەکانماندا لێکۆڵەرێکی ڕاستگۆ بین، لە ڕابردوومان بەهەموو خۆشی و ناخۆشییەکانییەوە، بەهەموو کارەسات و هەڵەو سەرکەوتن و ژێرکەوتنەکانییەوە، دەبێت بژارکەری مێژووییمان بین لەو ناڕاستییانەی نۆکەرو داگیرکەران خستوویانەتە پاڵ مێژووەکەمان لە نووسینەکانیاندا.

دیارە مەبەست لە نووسینەوەی ئەم بیرەوەرییە مێژووییەی شۆڕشی ئەیلوول- ١٩٦١ بۆ دەرخستنی کۆمەڵێک لایەنی شاراوەی شۆڕشەکەیە.

١- تائێستا هەر نووسین و بیرەوەریی و ڕووداوێک لەلایەن

هەر نووسەرێکی کورد یان بێگانەوە لەسەر کوردو کوردستان نووسرابێتەوە، جا لەسەر هەر بارو لایەنێکی ژیانی بێت، ئەو مەبەستە نەتەوەییەیان بەدەست نەهێناوە کە کوردێکی نەتەوەیی مەبەستییەتی، هەروەها ئامانج لێی ڕزگاری کوردەو یەکگرتنەوەی خاکی کوردستان و دامەزراندنی ڕژێمێکی نەتەوەیی سۆشیالیستییە، بۆئەوەی لەژێر سایەی نەتەوەکەمان بە بەختیاری و ئاسوودەیی ژیان بەسەربەرێت، بەڵکو هەموو ئەو نووسینانە بۆ دوورخستنەوەی ڕۆڵی کورد بووە لەڕێی ڕاستیی و سیاسی و بیروباوەڕی نەتەوەیی بە مەبەستی بەستنەوەی بە خەباتی هاوبەش لەگەڵ داگیرکەرەکان و هەوڵدان بۆ قازانج و ڕژێمی داگیرکەر، هەروەها ویستوویانە بیسەلمێنن بە کورد کە هێزی سەرنەکەوتنی شۆڕش و جوڵانەوەکانی نەتەوەی کورد، خۆ نەبەستنەوەمان بووە بە خەبات و تێکۆشانی هاوبەش لەگەڵ نەتەوە داگیرکەرەکاندا. ئەوەش لەژێر جۆرەها ناوی بریقەداری وەکو: (برایەتی، یەکێتیی نیشتمانی، یەکێتیی مەبەست و بەرژەوەندی و ئاینی و مێژوویی... هتد).

بەم نووسینانە زیاتر باری سەرشانی کوردیان قورستر کردووەو گەلەکەمانی بەرەو نائومێدیی بردووە، ئەمەش سەپاندنی ئەو واقیعە داگیرکراوەی سەر کوردستانی زیاتر پێکهێناوە.

٢- بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕێڕەوە سیاسی و بیروباوەڕییانەی ئەو پارت و کۆڕو کۆمەڵانەی لەو ڕووداوانەدا ڕۆڵێکی گرنگیان هەبووە چ بە چاکی، چ بە خراپی. بۆ ناساندنی ئەو باوەڕو ئایدیۆلۆژیا جۆراوجۆرانەی یاخود ئەو بەرە سیاسییانەی کە چاوبەستەکیان لە کورد دەکرد، بۆئەوەی پیشانی بدەن کە بۆ کوردو کوردایەتی کار

دەکەن، بەڵام لە تاکتیک و بڕواو کردەوەکانیاندا دژ بە جوڵانەوەی کوردایەتی ڕاستەقینە بوون، واتە لە بنەڕەتدا ئەوانە ڕزگاریی کوردو سەربەخۆیی کوردستان و یەکگرتنەوەی چوار پارچەکە هەرگیز ئامانج و مەبەستیان نەبووە.

٣- یان مەبەست لێی ڕۆشنکردنەوەو دەرخستنی ڕووی ڕاستی جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد بووە بەرامبەر بە کوردو کوردستان، هەروەها بۆ ئاشکراکردنی بیروڕاو ستراتیژ بووە لە شۆڕشی ئەیلوولدا، ڕووداوەکانیش ڕۆڵی گرنگیان بۆ هاوکاری و پشتگرتنی شۆڕش و پاراستنی و دیاریکردنی ڕێڕەو و ئامانج و ماف و داواکانی کورد لەو پلەیەی خەباتی شۆڕشی ئەیلوولدا هەبووە. بەگوێرەی تواناو بە گوێکردنیان.

٤- بۆ مەبەستی ڕاستکردنەوەی ئەو نووسین و نووسراوە ناڕاست و ناواقیعیانەی لەسەر مەسەلەی شۆڕشی ئەیلوول نووسراون، کە هەرکەس و پارت و کۆمەڵەیەک بەگوێرەی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان نووسیویانە. تەنانەت هەندێک لەو دامودەزگاو کەس و پارت و کۆمەڵانە خۆیان هاوبەشی بوون لەو ڕۆژە ڕەشەی کە بەسەر شۆڕشی ئەیلوولیاندا هێنا. بۆ دووبارە چەواشەکردن و دوورخستنەوەی نەتەوەی کورد لە ڕاستی و هەڵەکانی.

٥- ئەو ڕاستییە دووبارە دەکەمەوە کە ئەم تێڕوانین و هەڵسەنگاندنەی شۆڕشی ئەیلوول، لەبەر ڕۆشنایی بیروباوەڕی کوردایەتییە، لێکۆڵەرەوەی هەموو ڕاستی و واقیعەکانەو شیکەرەوەی هەموو هەڵوێست و بۆچوونەکانە، لە هەموو بارودۆخ و کاتێکدا ڕۆشنکەرەوەو هۆکاری ژێرکەوتنمانە. دەستنیشانکەری

هەڵەو کارو کردەوەی نالەبارو ڕۆشنکەرەوەی نەخشەو پیلانی سەرکەوتووە بۆ داهاتووی سەرکەوتنمان، بۆ دووبارە نەبوونەوەی ئەو ڕووداوە ناخۆش و دڵتەزێنانەیە کە دوارۆژی ڕەشیان سەپاند بەسەرماندا.

ئەم بیرەوەرییە مێژووییەم بەجۆرێک نوسیووە کە سادەو ساکار بێت، هەروەها دوور لە بەکارهێنانی وشە (اصطلاحاتی) بێناوەرۆکی بێکەڵک، بۆئەوەی ڕۆڵەکانی کوردو نەوەی داهاتوومان زۆر بەئاسانی و بێ پێچ و پەنا لێی تێبگەن، هەر لە جوتیارو شوان و زەحمەتکێشی کورد هەتا دەگاتە ڕۆشنبیرو سیاسی و شارەزایەک لێی تێبگەن و بێ گیروگرفت مەبەست بدات بەدەستەوە.

هەروەها بۆ زیاتر سوودگەیاندن و تێگەیشتن لە مەسەلەی کوردو کوردستان، بەپێویستم زانی بەشێوەیەکی ساکارو ئاسان، بەکورتی (کورد کێیە؟) (کوردستان کامەیە؟) (ئێستا لە چ بارودۆخێکدایە؟). هەوڵ دەدەم لە بەشەکانی داهاتوودا بەگوێرەی توانا وەڵامی ئەو پرسیارانە ڕوون بکەمەوە. بەپێویستیشم زانی بەدرێژیی لەبارەی (کوردو کوردستان) بنووسم، چونکە ئەمە زۆر پەڕاوی مێژوویی گەورە گەورەی لەسەر دەرچووەو نووسراوە، جگە لەوەش دووری دەخستمەوە لە مەبەستە بنەڕەتییەکەی ئەم نووسینەم، کە بیرەوەریی (شۆڕشی ئەیلوولی١٩٦١)ە، هەروەها دووریشی دەخستمەوە لە دیاریکردنی چۆنییەتی دروستبوونی ئەو شۆڕشەو کۆتاییهاتنی.

حەز دەکەم لەوەش ئاگادارتان بکەم، کە پاش تێکچوونی شۆڕشی ئەیلوول لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٨-ەوە دەستم کرد بە نووسینەوەی

ئەم بیرەوەرییە، کە لەماوەی چەند مانگێکدا ئامادەم کردبوو. ئەوەی ڕاستی بێت هیلاکییەکی زۆرم لەگەڵدا کێشا بە دۆزینەوەی ئەو بەڵگەو نووسراوانەی کە کاتی خۆی هەڵم گرتبوون. تەنانەت زۆری ئەو نووسراوانەی کە سوودم لێوەرگرتبوون بۆ ئامادەکردنی ئەم نووسینەم، دەمویست (زەنگوغراف)کەین هەر نووسینە لە شوێنی تایبەتی خۆیدا.

پاش کۆکردنەوەو نووسینەوەی بیرەوەرییەکان و تەواوکردنیان، خستمە بەردەستی مامۆستایانی دڵسۆزو خۆشەویست (ع-ج) وە (ع-س) کە وەکو سیاسی و ڕۆشنبیرێکی کورد تێبینی خۆیانم بۆ بنووسن. ئەوانیش دڵسۆزانە هەرچی تێبینییەکی هەیانبوو، بۆیان نووسیم، هەندێکیان پەسەندبوون بۆ گۆڕینی پاش و پێشی ناوەڕۆکی باسەکان، هەندێکی دیکەشی پەیوەندی نەبوو بەم نووسینەوە، تەنها دەربڕینی چەند تێبینییەکی خۆیان بوو.

پاش پووختەکردن و ئامادەکردنی لەگەڵ چەند هاوبیرێکی (پاسۆک) لە (نۆکان) ساڵی (١٩٨٧) لەگەڵ لقی سلێمانی (پاسۆک)، کە من بەرپرسیان بووم، ڕێککەوتین بەگوێرەی توانا چاپی بکەین و لە نووسراوە نەتەوەییەکاندا بڵاوبکرێتەوە. بەتایبەتی پەڕاوی دووەمیان، کە بریتیبوو لە کۆمەڵە نووسینێکی فکری، تەنزیمی، سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئەدەبی، هەروەها لەگەڵ چەند نووسینێکی تر لەبارەی پێشمەرگەو شۆڕش و شۆڕشگێڕی کوردو داگیرکەرو جاش و دووژمنانی کورد... هتد.

بەڵام جێگای داخ و دڵگرانی بوو کە ئەو هاوبیرانە کەسێکیان ناردبوو بۆ نووسینەکە، کە جێگەی باوەڕو متمانەی ئەوان بوو،

پاش پێدانی پەڕاوی بیرەوەرییەکانم، واتە پەڕاوی (بیرەوەرییەکی مێژوویی لە تێڕوانینی کوردێکی نەتەوەیی)ەوە، پاش ماوەیەک هاوبیرەکانم ئاگاداریان کردم کە ئەو دوو پەڕاوەیان بەدەست نەگەیشتووە. کاتێک لە کەسەکەیان پرسیبوو کوا ئەو پەڕاوانە، وتبووی (لەڕێگا لێم کەوتووە). لەڕاستیدا بەلای منەوە ئەم قسەیە دوورە لە ڕاستییەوەو جێگای بڕوا پێکردن نەبوو، لێرەدا ماوەی باسکردنی نییە کە ڕوونی بکەمەوە بۆچی مایەی بڕواپێکردنی نییە، هەروەها لەوکاتەشدا بارودۆخ وابوو کە نەتوانین بەوردیی لە جۆرو هۆکاری ونبوونی ئەو پەڕوانە بکۆڵینەوە.

ئەمە بەسەرهاتی ئەم نووسینەم بوو کە یەکەمجار بەو جۆرەی بەسەرهات، لەگەڵ پەڕاوەکەش ئەو هەموو نووسراو و بەڵگانەی لەگەڵیدا بوون، تیاچوون و نەدۆزرانەوە.

بۆ جاری دووەم پاش وەرگرتنی هەواڵی لەناوبردنەکە، لەسەر داوای چەند هاوبیرێکی لە (پاسۆک)، کە پێشتر لەکاتی خۆیدا نووسینەکەمیان خوێندبووەوە، زۆر بەتاسەوە داوای نووسینەوەی بیرەوەرییەکانیان لێکردمەوە. منیش لەبەر سوودو بەرژەوەندی بیروباوەڕی نەتەوەییمان، دەستم کردەوە بە نووسینەوەی مسۆدەی بیرەوەرییەکانم، کە پێشتر بەدەستی ئەو (تەتەرە) تیاچوون. ئەوەش بەگوێرەی تواناو پەنابردن بۆ بیرکردنەوەی خۆم بەتایبەتی و هاوکاریکردنم لە شۆڕش و پارتی و قوتابیان و ڕیزەکانیاندا، هەروەها کارکردن لە جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد دا، ڕۆڵی دروستکردنی چەند ڕێکخراوێکی نەتەوەیی کە ئێمە ڕۆڵمان تێدا بینیوە، هەر لە دروستکردنیدا لەگەڵ کۆمەڵێک هاوبیری تردا تا

دەگات بە سەرکردایەتیکردنیان، ئەوانیش وەکو (لاوانی نەتەوەیی کورد، یەکێتیی قوتابیانی نەتەوەیی کورد، پارتی گەلی، کاژیک). هەروەها لێپرسراوێتم هەبووە لە زۆرێک لە دامودەزگاکانی پارتی و شۆڕشی ئەیلوول و پارتە نەتەوەییەکاندا.

داوام وایە لە کەموکورتی ئەم نووسینەم چاوپۆشی بفەرموون، چونکە مەبەستم تەنها باسکردنی ڕاستی و ڕۆشنکردنەوەی ڕێگای خزمەت و شۆڕشی کوردو کوردستانە، هەروەها ئامانجم ون نەکردنی خوێنی ئەو شەهیدانەیە کە بەنرخترین شت گیانیان بوو، بەخشییان بە کوردو کوردستان.

هەروەها ئەم کتێبەم کرد بە چەند بەشێکی جیاجیا، کە ڕوون و ڕەوان بن بۆ تۆی خوێنەر، بەشەکانیش ئەمانەن:

# بەشی یەکەم
# کوردو کوردستان

## کوردستان:-
## نیشتمانی کورد کامەیە؟

کوردستان ئەو زەمینەیە کە نەتەوەی کوردی تێدا پەروەردە بووە، هەروەها بە خێروبێرو ئاو و هەواکەی ژیاوەو سوودمەند بووە. ئەم نیشتمانە سنوورەکانی لە سەرەوەی لە شاخەکانی (ئارارات)ەو لە خوارووشییەوە (کەنداوی فارس و عەرەبە)، لە ڕۆژهەڵاتەوە زنجیرە شاخەکانی (زاگرۆس)ەو لە ڕۆژئاواوە (دەریای سپی ناوەڕاست) ە. واتە کوردستان لە سنووری سەروویەوە (قەفقاس و وڵاتی لازستان)، لە خوارەوەی ڕۆژهەڵاتییەوە بە هێڵێ درێژبووەتەوە لە خۆرستانەوە تا ئەودیوی (جەبەل حەمرین) دەڕوات. هەروەها لە خوارووی شاخی (سنجارو لە بادیە شام) هەتاکو ئەسکەندەرونە درێژ دەبێتەوە.

لە ڕۆژئاواوە بە (ئەدەنەو سیواس و ئەنادۆل)و هەروەها لە ڕۆژهەڵاتیشەوە وڵاتی عەجەم و (هەمەدان و زنجان تەبریز) تا کۆتایی دێت، بە گەیشتنی ڕووباری (الرس لاراکس) لە قەفقاس خواروو، هەروەها لە خوارووش عێراق، کەواتە سنووری کوردستان بەگوێرەی دابەشکردنی ئێستای بەمجۆرەیە.

**یەکەم: سنووری کوردستانی سەروو:** واتە لە سەروویەوە ئازەربایجان و ڕوسیا، ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا بەشێک لە (سیواس، قارص، ئەردەهان، قرەباغ)و ناوچە شاخاوییەکانی بەشێک لە سەرووی هێڵی سنووری سوریا کە دەستپێدەکات لە

(سنجقە ئەسكەندەرونە)، ڕۆژئاوای سنووری عێراق، هەروەها لە سوریاش لە ڕۆژهەڵاتی ناوچەکانی (عەفرین، عین العرب، مدن الباب، جرابلس، تال ابیض، راس العین، دەرباسیە، عامودە، قامشلی، قبوا بیضو مالکییە) دەستپێدەکات، هەروەها لە ویلایەتە تورکییەکانیش لە سەرووی هێڵی سوریا کە ڕۆژئاوا دەکات، دەستپێدەکەن بۆ ڕۆژهەڵات وەکو (غازی عەنتاب، ئورفە، ماردین، دیاربەکر).

**دووەم: سنووری کوردستانی ڕۆژهەڵات**

بریتییە لە ئازەربایجانی ڕۆژئاواو ناوچەکانی خوارووی (گۆمی ئورمیە)، لەگەڵیدا بە کرماشانەوە دەوروپشتی ناوچەی بەختیارییە، لە خوارەوەش هەتا خوزستان لە دوایشەوە لکاوە بە سنووری کەنداوی عەرەبییەوە (شط العرب) بە کەنداوی فارسی.

**سێیەم: کوردستانی خواروو**

بریتییە لە ناوچەکانی پارێزگای (سلێمانی، هەولێر، کەرکوک، موسڵ و دهۆک) و هەندێک پارچەی (دیالە، بەدرەو جەسان و خانەقین). ئەم سنوورانەی کوردستان سروشتین جیاوازییەکی نییە بیسەلمێنێت کە کوردستان یەک نیشتمان و یەک پارچە نییە لە هەموو ڕوویەکەوە: جوگرافی، سیاسی و کۆمەڵایەتی.

**کوردستان:** کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە، سنووری سەرووی بەرزاییەکانی ئەرمینیا، لە سەروو ڕۆژهەڵات لە سەرووی ڕۆژئاوای بەرزاییەکانی ئەنادۆڵ درێژ دەبنەوە بە ئاسیای بچووک بەرەو ئێران، خوارووی ناوچەی عەرەب، ناوچەی شاخاویی دیارو ئاشکرا، بە پشتێنەیەک دەوری داوە: عێراق، سوریە، تورکیا، ئێران و سۆڤیەتە. لە خواروویشەوە نزیک دەبێتەوە بۆ نۆکەندی فارس.

**شارە گەورەکانی کوردستان**

- باکووری کوردستان:

دیاربەکر، دەرسیم، وان، بەتلیس، جولەمەرگ، بایەزید، ئەرزڕووم، ماردین، مووش، ئەدەنە، ئورفە، غازی عەنتاب.

ڕۆژئاوای کوردستان:

شارە سەرەکییەکانی بریتین لە: قامیشلی، حەسەکە، دێرەزوو، جەزیرە، کۆبانی، عەفرین.

- باشووری کوردستان:

سلێمانی، هەولێر، کەرکوک، دهۆک، عەقرە، شێخان، ڕەواندوز، عمادیە، کۆیە، هەڵەبجە، چەمچەماڵ، پێنجوێن، زاخۆ، خانەقین، ڕانیە، قەڵادزێ، دەربەندیخان، دووکان.

ڕۆژهەڵاتی کوردستان:

مەهاباد، سنە، سەقز، بانە، زەهاب، مەریوان، سەردەشت، شنۆ، کرماشان، نەغەدە، بۆکان، میاندواو.

- کوردستان سۆڤیەت:

ئەمە تەنیا پارچەکی بچووکی کوردستانە، کە بە پارچەی پێنجەمی کوردستان ناوی دەبرێت.

- کوردستان لەسەر نەخشە:

پانایی کوردستان (٦٥٠)کم٢، واتە سەرووی (٢٥٠٠٠٠)کم٢ دەبێت؟، خواروو (٢١٠)کم٢ ڕۆژهەڵات (١٩٠)کم٢. بەدرێژیی (١٠٠٠)کم بە پانی (٧٠٠)کم بەرەو سەرەوەی فراوان دەبێت و بەرەو خوارەوە تەسک دەبێتەوە.

- ژمارەی دانیشتووان:

ژمارەی دانیشتووانی کوردستانی گەورە (٢٥) ملیۆن کەسە، کە بەسەر هەر چوارپارچەی کوردستان بەمجۆرە دابەش بووە:

١. باکووری کوردستان ٩ ملیۆن کەس.

٢. باشووری کوردستان ٦ ملیۆن کەس.

٣. ڕۆژهەڵاتی کوردستان ٨ ملیۆن کەس.

٤. ڕۆژئاوای کوردستان زیاتر لە یەک ملیۆن کەس.

٥. کوردستانی سۆڤیەت زیاتر لە یەک ملیۆن کەس.

- ئاووهەوای کوردستان:

ئاووهەوای کوردستان لە زستاندا ساردەو باراناوییەو زستانی درێژە، بەفرێکی زۆری لێدەبارێت و باو و بۆرانی هەیە. ناوەندی بارانبارین لە کوردستاندا (٢٥٠-٦٥٠) ملم، لە شاخەکانیدا (١٠٠٠) ملم. توانەوەی بەفرەکانی لە هاویندا دەبنە هۆی دروستبوون و زیندووبوونەوەی سەرچاوە ئاوییەکان.

لەڕووی بەرزایشەوە خاکی کوردستان (٨٠٠-٩٠٠)م لەسەر ئاستی دەریاوە بەرزە. بەرزترین لوتکە چیاکانی کوردستان (هەکاری و زاگرۆس)ن، کە بەرزاییەکانیان لەنێوان (٤٠٠٠-٥٠٠٠) مەتردایە.

**- شاخە بەناوبانگەکانی**

گرنگترین شاخە بەرزەکانی کوردستان ئاراراتە، کە (کەشتییەکەی نوحی پێوە گیرساوەتەوە)، لوتکەکەی چوار وەرزی ساڵ بەفری لێ نابڕێت، شاخی ئاگریشی پێدەڵێن (زنجیرەی زاگرۆس) ئەم شاخانەی لێبووەتەوە: (قەندیل، کۆڕەک سورکێو، هەندرێن، قەرەسەرت، قەرەداخ، ئەزمەڕ، حەریر، سپیلک، چیا ڕەش، هەیبەت

سوڵتان، باواجی، سنان، سەری حەسەن بەگ، زووزک، کاژاو، چیای خیرات، بارزان، دەلەنێر).

- سەرچاوە ئاوییەکانی کوردستان:

١. دیجلەو فورات، مرادسو، قرەسو.

٢. زێی گەورەو زێی بچووک.

٣. سیروان (دیالە)و قیزل ادرمان، سیوەیل، قەلاچوالان، تانجەرۆ، ڕەواندوز.

**- شەلالەکان (تافگە)کانی:**

گەلی علی بەگ، بێخاڵ، پاشا کۆی سنجاق.

- گۆمەکانی کوردستان:

ئورمیە، زرێبار، لە ڕۆژهەلات، وان لە سەروو شاخەکانی ئارارات.

کانزاکانی کوردستان: نەوت، کبریت، مس، بەردی ئاسن، یۆرانیۆم، ئالتوون.

- کشتوکاڵ لە کوردستاندا:

دانەوێڵە، تووتن، میوەهات، سەوزە، بەخێوکردنی ئاژەڵ، مەڕ، مانگا، بزن، باڵندە.

٢. کورد کێیە؟ دانیشتووانی کوردستان کامانەن؟

دانیشتووانی کوردستان لە (٩٨٪)ی کوردن، ئاینی زۆربەی کورد ئیسلامەو مەزهەبی (سوونی)یە. چەند کەمەنەتەوەو ئاین لە کوردستاندا دەژین. وەکو تورکمان، ئەرمەن، ئاشوری، کلدان، مەسیحی، صابئە، جارانیش جوولەکەی تیا دەژیا پێش دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل. هەروەها عەرەب و فارس هەموو ئەمانە لە (٢٪)ی دانیشتووانی پڕ دەکەنەوە، ژمارەی ئەم کەمەنەتەوەییانەی

کوردستان ئاینیان وەکو یەک نین، ئەوانە هەڵگری ئاینی ئاسمانین، خۆیان بە کورد دەزانن و کوردن. کەمە نەتەوەییەکانی تریش وەکو تورک، عەرەب، فارس و ئەرمەن، ئەمانە بەهۆی دراوسێیەتیان لەگەڵ کوردو خاکی کوردستان ماونەتەوە. یان بەهۆی کاروباری بازرگانی و کشتوکاڵ و کارو کردەوەی پیشەیی، یان فەرمانبەرییان لە کوردستاندا کردووە. ئەم کەمە نەتەوەیی و ئاینییانە لە کوردستان سەربەستیی تەواویان هەیەو ئازادن لە هەموو ڕوویەکەوە. لەگەڵ کوردا بە ئارامی و ئاسایش و خۆشی دەژین، ئەمانە لەپاڵ زمانەکەی خۆیاندا بە زمانی کوردیش دەدوێن.

**کورد کێیە؟**

هەموو مێژوونووس و ڕۆژهەڵاتناس و لێکۆڵەرەوەکانی مێژوو، ئەوە دەسەلمێنن کە کورد نەتەوەیەکی جیاوازی خاوەن هەموو مەرجەکانی نەتەوەیە، وەکو: (نیشتمان، زمان، مێژوو، کەلەپوور، میراتی نەتەوایەتی، بەرژەوەندییەکی یەکگرتوو... هتد)، هەست و سۆزی واتە (شعور وادراک).

هەموو سەرچاوە کۆن و نوێیەکانی بێگانە ئەم ڕاستییەیان سەلماندووە، کە کورد کۆنترین نەتەوەیە لە نەتەوە کۆنەکانی سەر زەمین. لە دێر زەمانەوە لە دەرکەوتنی سەرەتای مێژوو کورد لە نیشتمانەکەیدا، کە کوردستانە، ژیاوەو پارێزگاری لە خۆی کردووە. ڕووداوەکانی مێژوو لە (ئەگزنیفون و ئەسکەندەرەوە) لە نووسراوە ئەرمەنی و سەرچاوە ئارییەکاندا ئەم ڕاستییەیان سەلماندووە.

ئەم کوردە لە نەتەوەکانی (هیندو ئەورووپییە) کە لە سەدە

دێرینەکاندا لە نیشتمانی خۆیدا ژیاوە. لەگەڵ نەتەوەکانی وەکو ئەرمەن... هتد، بەم نەتەوانەیان وتووە (ئاریاییەکان)، کە لە زمانی ساسانیدا بەمانای (وەچاخزادە، پیاوی ئازا، خۆڕاگر، بەوەفا، ڕەوەشتبەرز) هاتووە. ئەم وشەیە هیندییەکان بەکاریانهێناوە بۆ ئەو نەتەوانەی کە بە زمانەکانی (هیندوئەوروپی) دواون بۆ جیاکردنەوەیان لە نەتەوەکانی دیکە.

ئەم نەتەوە ئارياييانەش برتیبوون لە (ئەنگلۆ ساکسون)، (جەرمان، واتە ئەڵمانەکان)، (هیندی، فارس، کورد، ئەرمەن... هتد). ئەم نەتەوانە لە بنەڕەتدا لە یەک سەرچاوەن، بنچینەی زمانەکەشیان زمانی (لاتینییە). کوردیش وەکو هەموو نەتەوە ئارییەکانی دیکە، وەکو هیندو فارس و خاوەنی ئیمپراتۆرییەتی خۆی بووە. وەکو (ئیمپراتۆرییەتی میدیا)، کە جێگای شانازیی کوردەو سەلماندنی دەسەڵاتی کوردە لە دێرزەمانەوە.

ئەم نەتەوە ئارياييانە لە هەموو کات و زەمان و بارودۆخێکدا بەدەسەڵات بوون. تەنانەت مێژوونووس و ڕۆژهەڵاتناسان ئەو ڕاستییەیان سەلماندووە، کاتێک کورد ئامارەت و خاوەن دەسەڵات بووە، وەکو کۆنترین ئامارەتی( کەهرەت) زۆر لەم نەتەوانەی کە ئێستا لە پێش سەدەی چوارەمی زاینیدا ناو و شۆرەتیان هەیە، نە ناویان هەبووە، نە نیشتمانیشیان هەبووە.

هەروەها میدیایی کوردو ئاریایەتییان لە هەموو نووسراوەکانی ڕۆژهەڵاتناسی و لێکۆڵینەوەو مێژوونووسەکاندا سەلمێنراوە، وەکو (مینۆرسکی، باسل نکیتین، ئەدمونز، میجەرسون، ئەحمەد وفیق تورکی، علی السید گورانی، شرفخان بتلیس، امین سامی عمراوی،

منذر موصلاوی). هەروەها نووسەرو مێژوونووسەکانی تری ئەوروپا.

ئاشکرایە کە ئیمپراتۆرییەتی (میدیا) لە سەدەی حەوتەمی پێش زاینی دروستبووە، دەسەڵاتی زۆری ئەو شوێنانەی گرتەوە کە لە سەروو دەریای قەزوینەوە تا کەنداوی فارس لە خواروودا گەیشتنە بۆخارس، لە ڕۆژهەڵاتدا ڕووباری (قیزیل ئەرمەق) لە ڕۆژئاواشیدا هەموو زەوی کوردستان لەژێر دەسەڵاتیدا بووە، تا ئەوکاتەی (کۆرش) هێرشی گەورەی کردە سەریان و سەرکەوت بەسەریدا، ئەم ئیمپراتۆرییەتە کوردییەی تێکدا لە ساڵی (٥٥٠) پێش زاینیدا.

هەروەها زۆربەی زۆری مێژوونووسان و نووسەران وشەی (کورد) دەگەڕێننەوە بۆ ئەو مانایەی کە واتای (جەنگاوەر، نەترس، لێهاتوو)ە. هەندێکی دیکەیان دەیگەڕێننەوە بۆ وشەی (گووتو، کاردۆ، یان کاردونی)، ئەوکاتە ( ئەگزینیفون) لە ساڵی ٤٠١ی زاینی باسیکردوون.

ئەم کوردە ئامارەتی ( کەهرەت)و ئیمپراتۆرییەتی (میدی) گەلێک میرنشین و ئامارەتی دیکەی هەبووە. هەر بنەماڵەی (سەلاریەو حەسنەویە و شەدادیە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات) تا دەگاتە دەوڵەتی (دوسکی) مەروان و بنەماڵەی (یەک عەیار لە حلوان و ئامارەتی حەصن کەیف و ئامارەتی سلیڤانی، محمودی).

(دەنبەڵی– برادۆست) لە باکووری کوردستان، ئامارەتی موکری لە ڕۆژهەڵات، ئامارەتی جەزیرە، خێزان، شیروان بەتلیس، ساسون، سەوەیدلی، بازولین، مردەس دەرسیم. هەروەها چەند ئامارەتێکی گەورە و بەناوبانگی ئەم سەدەیەی دوایی وەکو (ئەردەڵان،

بابان، بادینان، هەکاری، بۆتان... هتد)، هەروەها دوو ڕژێم فەرمانڕەوایەتییان دەکرد، کە ئەویش حکومداری شێخ مەحمود لە باشووری کوردستان و کۆماری مەهاباد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

کورد یارمەتی گەلێک لەو نەتەوانەی داوە کە دراوسێی بوون و ئێستا بەشکێن لەو داگیرکەرانەی کوردیان لەژێر دەستدایە. هەر لە دەرکردنی یۆنانییەکان بۆ تورک و بەگژداچوونی ئینگلیزو هاوپەیمانەکانیان لە عێراق و سوریاو ئێراندا. کورد هەوڵی زۆری داوە بۆ بەهێزکردنی ئەو نەتەوانەو ڕژێمەکانیان، بەنیازی ئەو بەڵێن و پەیمانە درۆیینەی کە دابوویانە کورد، بەجۆرێک کوردیش دەبێتە خاوەن مافی خۆی، کەچی لە پاداشتدا لەبری ماف و ئافەرین و یارمەتیدانی کورد، کەوتنە گیانی و هەندێکیان بە تورکی شاخاویی ناو دەبرد، هەندێکی دیکەشمان بە فارس، هەندێکی دیکەمان بە عەرەب و هەوڵی بەعەرەبکردنمان. سەرەڕای ئەوەی هەر داگیرکەرێکیان کوردستان بە بەشێک لە نیشتمانەکەی خۆیان دەزانن. لەکاتێکدا ئەگەر ئەم ئامارەت و میرنشین و دەوڵەتە کوردییانە یەکیان بگرتایەو یەکێتییەکیان تێدا دروستبووایە، گەلێک گەورەترو بەهێزو پێشکەوتووتر دەبوون. لەم دەوڵەتانەی کە ئێستا هەن و کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە.

## بەشی دووەم
## دابەشکردنی کوردو کوردستان

سەرەتای دابەشکردنی کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٥١٤) زاینی لەکاتی ڕوودانی شەڕی (چالدێران)، کە لەنێوان ئیمپراتۆرییەتی (عوسمانی و سەفەوییەکان)دا ڕوویدا. بە هەڵگیرسانی ئەو شەڕە، ئەو میرنشین و ئامارەتە کوردییانەی کەوتبوونە نێوانی ئەو شەڕەوە، هەڵوەشێنرانەوەو کەوتنە ژێر چەپۆکی داگیرکردنی ئیمپراتورییەتی (عوسمانی و سەفەوییەکان). شەڕی چالدێران کە دروست بوو بەهۆی ئەو زوڵم و زۆرە لەنێوان (شیعەکانی سەفەوی) و (سونییەکانی عوسمانیدا) ڕوویدابوو، هەروەها هاتنی سەفەوییەکان بەرەو ڕۆژئاوا.

(سوڵتان سەلیم) کە دوای بایەزیدی دووەمی باوکی دەسەڵاتی گرتە دەست، دەترسان لەوەی (سەفەوییەکان) دیسان بێنە ئەو ناوچانەی عوسمانییەکان دەسەڵاتیان تیادایەو بۆ جارێکی دیکە بکەونەوە کوشتاری سوونییەکان، دواتر ناوچەکە بخەنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، بەتایبەتی میرنیشنە کوردییەکان و ئامارەتەکانیان. هەروەها ناوچەی ئەو خێڵە تورکانەی کە لە شاخە مەسیحییەکانی ناوچەی ئەرمینیا کەوتبوونە ئەو ناوچانەوە کە فارسەکانی چاویان تێبڕیبوو. بۆیە سوڵتان سەلیم دەستپێشخەری کردو کەوتە هێرشبردن بۆ سەر ناوچەکان و کوشتن و کاولکردنی (شیعەکان). بەو هێرشە گەورانە لە چالدێران لە نزیک ئورمییە هێزی فارسیان شکاندو بەرەو تەبریز ڕاویان نان.

ئەم هێرشانە بوونە هۆی ئەوەی ئەم ئامارەت و میرنشینە کوردییانە، پەیمان لەگەڵ لایەنی سەرکەوتوودا ببەستن، کە (عوسمانییەکان) بوون. دەبێت ئەوەش بزانین کە دەسەڵاتی عوسمانییەکان لە کوردستانی ناوەندو خوارووودا تەنها بەناو هەبوو. دابەشکردنی جاری دووەمی کوردستان دیسان بەهۆی شەڕوشۆڕی نێوان فارس و عوسمانییەوە بوو. لە ساڵی ١٦٣٩ بەهۆی بەستنی پەیمانی (ئەرزەرۆم) لەنێوان (سوڵتان مرادو شاعەباسی سەفەوییەکان) مۆرکرا. بەم پەیمانە ئەو ناوچانەیان دابەشکرد کە هەردوولایان لەسەری ڕێککەوتبوون. لەم ناوچانەش کوردستان و کورد بە هێڵێکی ڕاست کرا بە دوو بەشەوەو هەر بەشەی بۆ داگیرکەرێک بوو. بەجۆرێک ناوچەکانی (کەلهۆڕ ئەردەلان) بەر فارس کەوتن، ناوچەی (موکریان و شارەزوور) بەر عوسمانییەکان کەوت، بەڵام ناوچەی (زەهاب، ئەدرنەو ساکیس)یان هەروا هێشتەوە لەگەڵ ئامارەتی (عەمادییەو جەزیرە) بە سەربەخۆیی.

دابەشکردنی سێیەمی کوردستان پاش جەنگی یەکەمی جیهانی بوو، کە ئیمپراتۆری عوسمانییەکان تێکوپێک چوو. بە سەرکەوتنی بەرەی (دەوڵەتە هاوپەیمانەکان، کە برتیبوون لە ئینگلیز، ئەمریکاو ڕوسیا) بەسەر (سوێندخۆرەکاندا، کە برتیی بوون لە: ئەڵمانیا، ئیتاڵیاو بەشدارەکانیان)، هاوپەیمانەکان بە بردنەوەی جەنگەکە دەستیان گرت بەسەر ئەو نیشتمان و نەتەوانەدا کە کەوتبوونە سنووری دەسەڵاتی عوسمانییەکانەوە. ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەو بەشە گەورەیەی کوردو کوردستانە کە کەوتبوونە سنووری دەوڵەتی عوسمانییەوە.

لە سەرەتادا ئینگلیزو هاوپەیمانەکانی پڕوپاگەندەیان بڵاو دەکردەوە کە ئەوان داگیرکەر نین و هاتوون بۆ ڕزگارکردنی نەتەوەو نیشتمانە ژێردەستەو چەوساوەو زۆر لێکراوەکان. بەمجۆرە گەلێک پەیمان و بەڵێنی درۆیان دا بە کورد، کە سەربەخۆیی کوردستان و یەکگرتنەوەی مافێکی ڕەواو حەقێکی شەرعی کوردەو ئەوان هەمیشە لایەنگیری مافەکانی کورد دەکەن. بۆ ئەم مەبەستەش پەیمانی (سیڤەری ١٠ی ئاب ١٩٢٠) لەگەڵ تورکدا ڕێکخست، کە سەربەخۆیی بۆ ناوچەی کوردستان لە ڕۆژهەڵاتی فوراتەوە، خوارووی ڕۆژئاوای ئەرمینیاو سەرەوەی سنووری تورکیا بە تەنیشت سوریاو عێراق. ئەوەبوو بڕیاریان دا لە ماوەی شەش مانگدا ئەم پەیمانە جێبەجێ بکرێت. هەروەها لە ماوەی ساڵێکیشدا لەو بەروارەوە ئەگەر هات و کوردەکان خۆیان داوایان کرد لە (عصبة الامم) کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ جیابوونەوە، ئەوا (عصبة الامم) ڕازی بوو و بڕیاری سەربەخۆیی تەواویان بۆ بدات. لەلایەکی دیکەوە ئەگەر هاوپەیمانەکان ڕازی بوون، ئەوا کوردەکانی کوردستانی خوارووش، بەگوێرەی ئارەزوو خۆیان بۆیان هەیە داوای یەکبوونی بکەن لەگەڵ ئەو دەوڵەتە کوردییە سەربەخۆیەدا بن. ئەم پەیمانی سیڤەرە پێش دروستبوونی (دەوڵەتی عێراق)و هاتنی (مەلیک فەیسەڵ) بوو لەلایەن ئینگلیزەکانەوە.

داگیرکەرە هاوپەیمانەکان وەکو سروشتی داگیرکەرییانە بۆ سوودو بەرژەوەندی خۆیان ئەو بەڵێن و پەیمانانەیان لە بیری خۆیان بردەوە. ئەوەش لەبەر ڕازیکردنی تورکەکان ( تورکە کەمالییەکان)، دواتر کردنیان بە پاشکۆی خۆیان و بە دڵی

تورکەکانیان کردو پەیمانی سیڤەریان گۆڕی بە (لۆزان)، کە تێیدا حەق و مافی چارەنووسی کوردیان تێدا پێشێل کردو هەمووی کرا بە قوربانیی بەرژەوەندی و سوودی داگیرکەرە گەورەکانی ڕۆژئاواو نۆکەرەکانیان.

هەرچەند لە سەرەتای کەوتنی عوسمانییەکاندا هەر لە ساڵی ١٩١٩ ڕێگایان دا بە شێخ مەحمود کە حکومداریی ناوچەی کوردستان بێت، بەڵام لەبەر ئەو هۆیانەی کە هەندێکی پەیوەندی بە خۆمانەوە هەیەو هەندێکیشی پەیوەندی بە سیاسەت و ئاڵوگۆڕی و بەرژەوەندیی سیاسەتی داگیرکەرانەوەیە، نەتوانرا ئەو حوکمدارییە بچنینەوە و فراوان بکرێت، بەجۆرێک کوردستان لەژێر دەسەڵاتیدا لە گەشەکردن و سەرکەوتن و پێشکەوتنیدا سەرپشک بکرێت.

کورد لە هەموو سەردەمێکدا بە ژیانی ژێردەستەیی و داگیرکراویی ڕازی نەبووەو نابێت. بۆیە هەر لە پاش کەوتنی عوسمانییەکان لە شۆڕش و جوڵاندن و هەستاندا بۆ سەندنی مافەکانی و بەدەستهێنانی چارەنووسی خۆی. هەر لەو ڕێگەیەشدا قوربانییەکی زۆری داوەو خوێنێکی زۆری بۆ ڕژاندووەو ماڵوێرانی و کاولبوون و نەبوونیی و دەربەدەریی چەشتووەو هەرگیز کۆڵی نەداوە. شۆڕشەکانی (شێخ سەعیدی پیران، شێخ عەبدوڵڵای شەمزینی، بەدرخانییەکان، شێخ مەحمودی سلێمانی، بارزانی خوێناوی، سمکۆی قارەمان و مەهابادی خوێناوی) باشترین بەڵگەی سەرشۆڕنەکردنی کوردو ڕازینەبوونییەتی بە ژێردەستەیی و داگیرکراوی.

بەمجۆرە داگیرکەرە ڕۆژئاواییەکان (ئینگلیزو هاوپەیمانەکان) سەرکەوتووەکانی جەنگی کوردو کوردستانیان بەجۆرێک

دابەشکرد، هەر بەشێکیان بەست بە پارچەو نیشتمان و نەتەوەیەکی جیاو بێگانە بە کورد. لە وڵاتانی ترەوە سەرۆک و پادشایان دەهێنا بۆ فەرمانڕەوایی ئەو ڕژێمانە کە بۆیان دادەمەزراندن.

بەمجۆرە کوردستانی خواروویان بەستەوە بە عێراق، هەروەها بەشێکی بە سوریاو سەروشیان بە تورکیاوە، ئەو بەشەش کە بە فارسەوە بوو، هەروا بەو جۆرە مایەوە. ناهەقییەکی گەورەیان لە مێژوو کرد. هەروەها لە کوردو کوردستان، کە هەتاهەتایە لەبیر ناچێتەوە.

ئینجا ئەم داگیرکەرانە کەوتنە ڕژێم دروستکردن و قەوارە بەهێزکردنی ئەو نەتەوانەی کوردو کوردستانیان بەسەردا پارچە پارچە کردن. سەرۆک و فەرمانداریيان لە دەرەوەی ئەو وڵاتانەوە هێناو سەپاندیان و نەتەوەی کوردو کوردستانیشیان کرد بە کەلوپەلی بازرگانی و سەواو مەمەڵەیان پێوەکرد. چووینە ژێر دەستی زۆر نەتەوەوە، کە لەکاتێکدا کورد خاوەن ئامارەت و میرنشینی و ئیمپراتۆرییەت بوو، ئەوانەی کە ئێستا سەربەخۆن و خاوەن ڕژێم و دەسەڵاتن، تەنانەت لە شارستانییەت و ژیریی و لێزانییەوە دوور بوون، نە ناویان هەبوو، نە ناونیشان و لە وڵاتانی دیکەوە کۆچڕەوییان دەکرد. بەم دابەشکردنەی کوردستان سنوورێک نەمایەوە کە داگیرکەرێک تێیدا هاوبەش بێت. ئەم بەشکردنە کارەساتیک بوو کە بەدرێژایی مێژوو بەسەر هیچ نەتەوەیەکی تری ژێردەستەدا نەهاتووە. بەشکردنەکەمان بۆ (تەتریک و تەفریس و تەعریب)

بوو، مرۆڤایەتی و شارستانییەت و دادپەروەری و مافی مرۆڤ و ڕەوشتی لەم بەشکردنەدا دوورەپەرێز بوون.

لەو کاتەوەی کەوتووینەتە ژێر چنگی ئەم داگیرکەرانە، لە کوشتن و ماڵوێرانی و کاولکردن و کارو کردەوەی بێ ڕەوشتانە زیاتر، کورد هیچ چاکەو خێرێکی نەبینیوە. لەباتی خۆشەویستی و بەهێزکردنی گیانی برایەتی و مرۆڤایەتی و دادپەروەری و پێشکەوتن و پاریزگاری لە حەق و ماف و پێویستی ژیان. ئەم داگیرکەرانە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو چارەڕەشی و تواندنەوەو کوێرکردنەوەی ناوی کوردستان، هەروەها پووکانەوەی قەوارەی نەتەوایەتی سەرکوتکردنمان و بۆ ئەم مەبەستانەیان، جۆرەها ڕێککەوتن و پەیمانیان لەنێواندا دروستکردووە. هەر لە پەیمانی (سەعد ئاباد، پەیمانی بەغداد) تا دەگات بە (پەیمانی جەزائیرو پەیمانەکانی نێوان عێراق و تورکیا... هتد).

تەنانەت داگیرکەرەکانی کوردستان لە ژێری و لە بەرژەوەندی لێکدانەوەو شارستانییەت و کردەوە، زۆر جیاوازییەکی گەورەیان هەیە لەگەڵ ئەو داگیرکەرە ئابووری و سەربازی و سیاسییانەی تری دونیا. زۆر هۆکار هەبوون بۆ دابەشکردنی کوردستان و ژێردەستەکردنی کورد، کە هەندێکیان پەیوەندییان بە بارودۆخ و ئاڵوگۆڕی سیاسی و بەرژەوەندییە نێودەوڵەتییەکان و هەروەها سودو بەرژەوەندی سیاسی و تاکتیکی و ستراتیژی داگیرکەرەکانی ڕۆژئاوا هەبووە، هەندێکیشیان پەیوەندی ڕاستەخۆیان بە خۆمانەوە هەیە، ئەویش لە جۆری هەڵسوکەوت و ڕێڕەوی سیاسی و بۆچوون و هەڵەکانی خۆمان.

کە ئەمانە بوون:

١- نەبوونی ڕێڕەوێکی سیاسی دیارو ئاشکرای نەتەوەیی، کە لەبەر ڕۆشنایی بیروباوەڕی نەتەوەیی بێت، هەروەها تاکەکانی کورد یەکبخات و بیانبەستێتەوە بە بەرژەوەندی و سودی گشتییەوە. لە ڕێگەی پاراستنی قەوارەی نەتەوەیی و مانەوەی نیشتمان بە سەرکەوتوویی و سەربەرزیی لە هەموو ڕوویەکی ژیانەوە، چ سیاسی، چ فکری، یان کۆمەلایەتی و ئابووری.

٢- دیارینەکردن و یەکنەخستنی ئامانج و ماف و داواکانی نەتەوەی کورد.

٣- دلپاکی و سادەیی و هەلپەرین بۆ دەنگی هەموو دەهۆلێک. لەگەل ئەوەشدا بڕواکردن بەهەموو بەلێن و پەیمانێک، گوێڕایەلیمان بۆ هەموو قەوان و ئامرازێک.

٤- سودوەرنەگرتنمان لە هەلەو هەلەکارییەکانی خۆنەبەستنەوە بە بڕیارێکەوە، زوو پاشگەزبوونەوەمان و ئەمبەرو ئەوبەرکردنمان.

٥- ڕێگەدان بە فراوانکردنی ناکۆکی و دووبەرەکی نێوان نەتەوەکەمان لەسەر بەرژەوەندی و سوود، بەتایبەتی لەسەر حسابی مافی کوردو بەرژەوەندیی گشتی.

٦- تێنەگەیشتن و نەناسینی داگیرکەرو دوژمن، هەولنەدان بۆ ڕوونکردنەوەی کردەوەو کارو نەخشەو پیلانی داگیرکەرو دوژمن و ناساندنیان بە نەتەوەکەمان.

٧- ئەزموون وەرنەگرتنمان لە ژێرکەوتن و سەرکەوتنەکانی نەتەوەکانی دنیاو هی نەتەوەکەی خۆشمان.

٨- گەمەکردن بە مەسەلەی نەتەوەو نیشتمان و بەستنەوەی

بە بەرژەوەندی و سودی داگیرکەر لەژێر ناوی جۆربەجۆردا، کە هەمووی دەبنە هۆی ڕێگا ونکردن لە نەتەوەکەمان.

٩- نەناسینی خۆمان و کەمتوانایی لە جۆری هەڵسوکەوتمان بەگوێرەی چۆنییەتی سروشتی دروستبوونی نەتەوەکەمان.

**ئەو هۆیانەی پەیوەندییان بە دەرەوەی خۆمانەوە هەیە، بریتین لەمانە:**

١- ناوچەی کوردستان، ناوچەیەکی گرنگی پڕ لە کانزاو سامانە سرووشتییەکانە، وەکو نەوت و کبریت، مس و بەردی ئاسن، تەنانەت لە زۆر ناوچەدا یۆرانیۆم دۆزراوەتەوە... هتد.

٢- ناوچەیەکی گرنگی ستراتیژی سیاسی و سەربازییە، کەوتووەتە نێوان جۆرەها ناوچەو نیشتمان و نەتەوەی جیاجیاوە، کەوتووەتە ڕێڕەوی سیاسی جۆربەجۆرو بەرژەوەند دیارو ئاشکرای سەربازی و ڕژێم جۆراجۆری ئابووری و فکرییەوە.

٣- ناوچەیەکی گرنگی سەخت و قایمی سروشتییە بۆ خۆڕاگرتن و پارێزگاری لە دەسەڵاتگرتن بەسەر ناوچەکەدا. زۆر کەندو کۆسپ تەخت و ئاسان و سوک دەبێت بۆ جوڵانەوە سەربازییەکان و مسۆگەرکردنی سەرکەوتن لە کارو کردەوەی سەربازیدا.

٤- ناوچەیەکی گرنگی ئابووری و کشتوکاڵییە، بەهۆی جۆرەها لە سەرچاوە ئاوییەکان و سەدەکانی، تواناو هەڵکەوتی ناوچەکە بۆ جۆرەها کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ و سامانی ئاژەڵی، هەروەها جۆری دانەوێڵەکان کە دەچنە پیشەسازییەوە.

٥- نەتەوەیەکی دڵپاک و سادەو جەنگاوەرێکی خۆڕاگر، چاونەترس و چالاک و ئازای تێدا دەژی، کە خۆشبڕواو بێ تەماع

و جێبەجێکەری هەموو کارو فەرمانێکە.

٦- سەرەڕای بەرژەوەندی داگیرکەرو نەتەوەکانی دەوروبەر بۆ دەسەڵاتگرتن بەسەر ناوچەکەو بەهێزکردن و پتەوکردنی دەست و پێوەندەکانیان لەو ڕژێمە نۆکەرانەو سەپاندنی سیاسەت و ڕێڕەوی خۆیان بۆ دروستکردنی بازاڕێکی ئابووری گرنگ لە ناوچەکەدا.

٧- تێگەیشتن لە سروشت و دروستبوونی کورد کە ناگونجێت لەگەڵ سەرنەویکردن بۆ نۆکەری و مانەوەی لەگەڵ داگیرکەردا هەتا سەر.

٨- بەکارهێنانی کارتی ئاینی ئیسلام و بەستنەوەی بەو بڕوایەوە، وەک کورد درێغی نەکردووە لە خەبات و شۆڕش و کۆڵنەدان، کەم نەتەوە دەتوانێت بەو جۆرەی کورد بەرگری لە خۆی بکات و بەرەنگاری دوژمن بوەستێت، چونکە باردۆخ و جوگرافیای کوردستان، سروشتی داگیرکەرەکان، نەبوونی پاڵپشتێکی ستراتیژی بێ مەبەست، وەکو هەڵەکردن و دوورخستنەوەی نەتەوەکانی دونیا، بەتایبەتی بەدەسەڵاتەکان لە ماف و چارەنووسی کورد، کەواتە سەرەڕای ئەو مەودایەو داگیرکراوییمان، نەک وەکو ئەو داگیرکەرە ئابووری و سەربازییانەی کە بۆ مەبەستێکی تایبەتییان و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، تەنانەت بیرکردنەوەو کارو کردەوەشیان زۆر جیاوازترن لە داگیرکەرەکانی کوردستان، کەواتە نەتەوەو نیشتمانی ئێمە زۆر بریندارترو چەوساوەترو زۆرلێکراوەترە لەو نەتەوە داگیرکراوانەی تری دونیا.

بۆیە پێویستە ئێمەش وەک کورد بیروباوەڕێک هەڵبژێرین بۆ ڕزگاربوون و سەربەخۆییمان، کە بگونجێت لەگەڵ شۆڕش و

خەباتی نەتەوەکەماندا. دەبێت بیروباوەڕێک بێت لە ڕاستی و واقیعیبوونی نەتەوەکەمانەوە دروست بووبێت و هەڵهێنجراوی پێویستی مانەوەو سەرکەوتن و پێشکەوتنی نەتەوەکەمان بێت لە هەموو بارێکەوە، چونکە بەم بیروباوەڕەی جۆری خەبات و شۆڕش و شۆڕشگێڕیمان، ڕێڕەوی سیاسیمان دیاری دەکات، بە سەرکەوتن و شادمان دەکات و نەخشەو پلانەکانی دەکێشێت، لەبەر ڕۆشنایی سودو بەرژەوەندی کوردو کوردستان.

## بەشی سێیەم
## شۆڕش و سەرکردەکانی کورد

شک لەوەدا نییە هەموو شۆڕش و جوڵانەوەکانی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستان بۆ بەرگریکردن و پارێزگاریکردن بووە لە قەوارەی نەتەوایەتیمان، بۆ پاراستنی کوردستان و بەدەستهێنانی ماف و ئامانج و ئاواتەکانی کورد بووە بە مافی ئازادی، سەربەخۆیی و یەککگرتنەوەی خاکی هەرچوار پارچەکەی کوردستان. ئەوانەی لەو ئامانج و ڕێگایەدا تێکۆشاون، بریتیبوون لەو کوردە دڵسۆزو چاپووک و ئازاو لێهاتووانەی کە گیانیان بەخشیوەو ئامادەی گیانبەخشین بوون. سەرکردایەتی هەموو شۆڕش و جوڵانەوەو هەستانەوەکان کەسانێک کردوویانە کە خاوەنی هەست و سۆزی نیشتمانپەرستی و نەتەوەیی بوون، دڵسۆزو دڵپاکی کوردستان بوون، هەروەها کوردیان لا پیرۆزو خۆشەویست بووە.

سەرکردەو ڕەمزی شۆڕشەکانی کورد، سەرۆک خێڵ، یان ڕابەرێکی ئاینی، یان کوردێکی بەدەسەڵاتی ناودارو بڕواپێکراو بوون. لە دیوەخان و مزگەوت و تەکیەو خانەقای ئەم سەرۆک خێڵ و ڕابەرە ئاینی و ناودارو بەدەسەڵاتانەدا تەکبیرو نەخشەو پلانیان بۆ شۆڕش و جوڵانەوەو ڕاپەڕینەکان کێشاوەو بڕیاریان لەسەر دراوە. لەم مەڵبەندانەدا کورد بەشێوەیەکی سەرپێی لە مەسەلەی ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانە تێدەگەیەنراو بە هەست و سۆزێکی پاک و بە دڵێکی گەرمی بەجۆشەوە دوای ئەو سەرکردانە دەکەوت. بەجۆرێک کە ئامادەی هەڵمەتبردن و گیانبەخشین بوون. بەگوێرەی تواناو

لێهاتوویی و جۆری لێپرسراویێتی و کارو چالاکییەکان، شۆڕشگێڕان دیاریی دەکران. سەرکردەکانی ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانە بەهۆی تێکەڵی و هاتوچۆیان لەگەڵ زۆر کەسانی نیشتمانپەروەرو شارەزاو خوێندەوارو پیاوانی سیاسی و سەربازی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی، زیاتر لە دۆخی دونیا تێدەگەیشتوون و شارەزاتر بوون، هەمیشە هەواڵ و دەنگوباسیان پێدەگەیشت، تاڕادەیەکی زۆریش ئاگاداری دۆخی ناوچەکە بوون. لەلایەکی ترەوە، بەهۆی دەسەڵات و بوونی دارایی و هێزو توانای ئابوورییانەوە، هەروەها تێکەڵبوونیان و شارەزابوونیان لە هەست و پێویستیی خەڵکەکەی دەوروپشتیان بووە هۆی ئەوەی گوێیان بۆ بگیرێت و فەرمان و بڕیارەکانیان بەئاسانی بەئەنجام بگەیەنرێت. لەلایەکی ترەوە، مەڵبەندی ئەم سەرکردانە خانەقاو مزگەوت و تەکیەو دیواخانەکان، جێگای چارەسەکردنی تەنگوچەڵەمەی خەڵک بوون، جێگای کۆبوونەوەو وتووێژو هەروەها جێگای باس و خواسی هەواڵ و دەنگوباسە سیاسی، کۆمەڵایەتی و کشتوکاڵییەکان بوون، سەرەڕای ئەوەی شوێنی بازاڕو بازرگانی و کڕین و فرۆشتن و سوارچاکی و ئازایەتی و وەفاو ڕەوشت و پەندی پێشینان و شیعرو چیرۆک و کارو کردەوەی مرۆڤانە بوون.

ئەم سەرکردانە ناندەرو پشت و پەنای خەڵکەکە بوون، لە خۆشی و ناخۆشییاندا ئەنجامی دەستکەوتی ئەم سەرۆک خێڵ و ڕابەرە ئاینی و ناودارە بەدەسەڵاتانە بە عارەقی ناوچەوان بووبێت، یان لەسەر ماندوویێتی و هیلاکی ڕەشوڕووت و زەحمەتکێشانی ناوچەکەوە بۆیان، بەهۆی زەویوزاری و دەسەڵاتیان لە ناوچەکەدا

بوو بێت، لای خەڵکی ناوچەکە ڕۆڵیان بینیوە بۆ چارەسەرکردنی، ئەوەش بەئاشکراو هەموو کوردێک دەزانێت کە زۆری سەرکردەو پیاوە سیاسی و کادیرو ئەندام و لایەنگرانی پارتە سیاسییەکان و لە نیشتمانپەروەران، لە پەنای ئەم سەرۆک خێڵ و ڕابەرە ئاینی و ناودارە بەدەسەڵاتانەدا حەشاردراون و پارێزگارییان لێدەکرا دژی ڕژێمەکان.

هەروەها زۆر لەم سەرکردانەی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کورد لە ئاغاو بەگ و شێخ لە سەرکردایەتییاندا خاوەن مەبەست و ئامانجێکی پاک و ڕوون بوون، بەگوێرەی توانای دارایی و ماڵ و توانای خۆیان بۆ بەرژەوەندیی گشتی بەخشیوە بە شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کوردو کوردستان. تەنانەت هەندێک لەم سەرکردانە گیانی خۆیان و ماڵ و منداڵ و براو کوڕو کەسوکاریان کردووەتە قوربانیی بۆ سوودی کوردو کوردستان، دەبێت ئەو ڕاستییەش لەبیر نەکەین کە هەندێک سەرۆک خێڵ و ئاغاو بەگ و شێخ و ڕابەرە دینییەکان، کە هاوکاری شۆڕش و ڕاپەڕینێکی کوردیان کردبێت، یان بۆ مەبەستێک بووە، یان لەترسا، یان بۆ پاراستنی دەسەڵات و دارایی و سامانەکەی بووە. ئەم جۆرەیان هەرکاتێک بۆیان ڕەخسابێت بەرەی نەتەوەکەیان چۆڵکردووەو چوونەتە پاڵ داگیرکەرو دوژمن و چەکی خیانەتیان کردووەتە شان دژی کوردو کوردستان، هەندێکی دیکەشیان کە زانیبێتیان بەرەو زەرەرو زیان دەچن و بەرژەوەندییەکانیان لەدەست دەچێت، ئەوا پاشەکشەیان کردووەو دوورکەوتوونەتەوە لە شۆڕش و ڕاپەڕینەکان.

نموونەی سەرکردە دڵسوزو ڕاست و نیشتمانپەروەرەکان

ئەمانەن: (شێخ سەعیدی پیران، شێخ عبدوڵڵا شەمزینی، بەدرخانییەکان، شێخ مەحمودی حەفید، مستەفا بارزانی، سمکۆی شکاک، قازی محەمەد، میری ڕەواندز، میرانی بابان، میرانی بۆتان، بادینان، پاشای کۆرە). نموونەی هەندێک لەو سەرۆک خێڵ و ئاغاو بەگ و شێخ و ڕابەرە ئاینییانەی کە ڕۆڵی خیانەتیان بینیوە لە شۆڕشەکاندا: (مەلای خەتێ، ئاغاکانی پشدەر، سورچی و زێباری،... هتد). زۆر سەرۆک خێڵ و شێخ و ڕابەری تری ناوچەکانی کوردستان.

ئەوەش ڕاستییەکی چەسپاوە کە هەرچی میرنشین و ئامارەتی کوردو شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کوردە، هەمووی لەم سەرۆک خێڵ و ڕابەرە ئاینی و ناودارە بەدەسەڵاتانەی کورد پێکهاتبوون، لە کۆنەوە تا شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١. لە مێژوودا شۆڕشێک نییە لەم کەسانە سەرکردایەتی نەکرابێت، تەنها (کاوەی ئاسنگەر) ئەویش ئاڵاو سەرکردایەتییەکەی دایە دەست (فەرەیدوون)، ئەویش خۆی و نەتەوەکەی بە مایەپووچ دەرچوون.

# بەشی چوارەم
## شۆڕشی ئەیلوول- ساڵی ١٩٦١

پاش سەرکەوتن بەسەر ڕژێمی پاشایەتیدا لە عێراق لە ڕۆژی ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨، لە پاش ڕووخاندنی دامودەزگای سەپێنراوی پاشایەتی، کە داگیرکەرە ڕۆژئاواییەکان، بەتایبەتی (ئینگلیز) بەسەر خەڵکی عێراق و کوردستانی خوارووودا سەپاندیان، بۆ جێبەجێکردنی خواست و ئارەزوو و بەرژەوەندییەکانیان، (شۆڕشی ١٤ی تەمموز) کە بە هاوکاری و گیانی نیشتمانپەرستی ئەفسەرە عەرەب و کوردەکان جێبەجێکراو سەرکەوت بەسەر دامودەزگای نۆکەری ئینگلیزدا. مەودایەکی فراوان و بەکەڵکی دروستکرد بۆ هۆشیارکردنەوەو بڕوا پتەوکردن و بەئاگاهێنانەوەی نەتەوەی کوردو تێگەیشتنی لە مەسەلەی مافەکانی و ئاواتە نیشتمانی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانیاری و ڕۆشنبیری کورد لە کوردستانی خوارووودا.

لە یەکەم ڕۆژی شۆڕشی ١٤ی تەممووزدا کورد پشتگیری و پشتیوانی خۆی نیشاندا بۆ سەرکردایەتیی شۆڕشی تەمموز (عەبدولکەریم قاسم)، بەو هیوایەی ئەم شۆڕشی ١٤ی تەممووزە ئاسۆیەکی نوێی بۆ مافی کورد هێناوەتە پێشەوە. ئەوە بوو لە دەستووری کاتیدا سەرۆکی شۆڕش (عەبدولکەریم قاسم) لە ماددەی (٣)دا ئەو مافەی کوردی سەلماند کە عێراق هاوبەشە لەنێوان کوردو عەرەبدا. هەروەها بڕیاری گەڕانەوەی (بارزانی و بارزانییەکانی) دا لە (یەکێتیی شورەویی)ەوە بڕیاری بەردانی گیراوە

سیاسییەکانی کوردی دا، هەروەها گەڕانەوەی دوورخراوەکان، کە دەرکرابوون لە ناوچەکانیان. هەروەها گەڕانەوەی فەرمانبەرو کاربەدەستان کە دەرکرابوون، بۆ سەر ئیشوکارەکانیان، دواتریش فەرمانی بۆ دەرکردن.

هاوکات مەودایەکی فراوانیشی دروستکرد بۆ هاتنە مەیدانی کارکردنی سیاسی و نیشتمانی وەکو پارتە سیاسییەکان و ڕێکخراوە کوردستانییەکان، بە نموونە: (پارتی دیموکراتی کوردستان، ڕێکخراوەکانی قوتابیان، لاوان، ئافرەتان و مامۆستایانی کورد)، هەروەها نەقابە پیشەییەکان. ڕێگەدان بە دەرکردنی (گۆڤار، ڕۆژنامەو پەڕاوەکانیان). دەبێت ئەوەش بۆ حەق بڵێین شۆڕشی تەمموز ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو بۆ فراوانکردنی بیرکردنەوەو چاوکردنەوەو بوژاندنەوەی هەست و سۆزی نیشتمانی و نەتەوەیی هاوڵاتییانی کورد، هاوکات پێگەیاندن بە هەستی خۆشەویستی بۆ کوردستان، یاخود بۆ وریاکردنەوەو هاندانیان بۆ تێگەیشتن لە مەسەلەی کوردو کوردستان و ئەو بارودۆخانەی بەسەریاندا تێپەڕیبوو، مەسەلەی ماف و ڕوونکردنەوەی ئامانج بەتایبەتی. لەلایەکی تریشەوە زۆر گرنگە ڕۆشنکردنەوەو ڕوونکردنەوەی زۆر ڕێڕەوی سیاسی و بیروباوەڕی جۆربەجۆرو شیکردنەوەی ناوەڕۆکەکانیان، هەروەها مەبەستی دیارو ئاشکراو نهێنییان ئەو کۆڕو کۆمەڵ و پارتە سیاسی و نیشتمانی و نەتەوەیی و دیموکراتی و چینایەتییانەی کە لە کۆڕی ئیشوکاردا بوون، پەردە لادان لە ڕوویان و دەرخستنی حەقیقەتی کردەوەکانیان، بەهۆی دروستبوونی ناکۆکی ئایدیۆلۆژی و بەرژەوەندی و سوودی تایبەتییان. واقیعی ئەوانە ئاشکرا بوو کە

تا چ ڕادەیەک لەگەڵ مافی کوردن و هەڵوێست و بۆچوونیان چۆنە بەرامبەر مەسەلەی کوردو کوردستان.

شۆڕشی ١٤ی تەمموز سەنگی مەحەک بوو بۆ ئەو پارت و بیروباوەڕ سیاسییە جۆربەجۆرانەی کە لە پشت شۆڕشی تەممووزدا گەلێک ئامادەیی وایان پیشان دەدا، کە خەبات بۆ مافی چارەنووسی کورد بکەن. زۆر بەئاسانی و بێ پێچ و پەنا کورد لە مەبەست و ڕێڕەوی سیاسی و بیروڕای ئەوانە تێگەیشت. هاوکات شۆڕشی ١٤ی تەمموز ئەو ڕاستییەی بە کوردپەروەران سەلماند کە کوردو کوردستان چاوەڕوانی خەباتی گشتی نەتەوەکەیەو پێویستی سەرشانی هەموو کوردێکە، کە هاوکاریی بکات بەگوێرەی تواناو لێهاتنی لە خزمەتی کوردو کوردستاندا.

پاشان لەبەرئەوەی ئەم پارت و ڕێڕەوە سیاسی و بیروباوەڕە هەمەچەشنانە کە لەدوای ١٤ی تەممووزەوە ڕۆڵیان هەبوو لەسەر شانۆی سیاسی، هەروەها ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو بۆ ماف و داواکاری شۆڕشی کوردو دیاریکردنی پاشەڕۆژی ئەو شۆڕشە، بۆیە بەپێوستمزانی کە لەسەر ئەم کۆڕو کۆمەڵ و پارتە سیاسییانە بدوێم، بەجۆرە باسکردن و شیکردنەوەیە بەمەبەستی ستراتیژی و تاکتیک بەرامبەر بە مەسەلەی کوردو کوردستان دیاری بکەم.

ئەو کۆڕو کۆمەڵ و پارتانەش ئەمانەن:

١- حزبی شیوعی عێراق.

٢- بەعس و نەتەوەییەکانی عەرەب.

٣- پارتی دیموکراتی کوردستان.

٤- حزبی دیموکراتی وطنی تقدمی (محەمەد حەدید).

- حزبی شیوعی عێراق و مافی کوردو شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١

ئەم پارتە وەکو پارتێکی (ئوممی) خاوەن بیروباوەڕی مارکسیزمی لینینزمی چینی کرێکارو لەبەر ڕۆشنایی بیروباوەڕو هەڵویست و ستراتیژی و تاکتیک، بۆچوونەکانی خۆی دیاری دەکات و نەخشەو پلانەکانی دەکێشێت، ئەوەش لەبەر سودو بەرژەوەندی بیروباوەڕەکەی. ئەم پارتە خەباتی کورد بە بەشێک لە خەباتی گشت خەڵکی عێراق دادەنێت. واتە خەباتی کورد دەبەستێتەوە بە خەباتی هاوبەشی و یەکگرتوویی عەرەبی عێراقەوە، هەروەها بەو چاوە سەیری خەباتی کورد دەکات لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا، لە کوردستانی خوارووداً ئەم پارتە لقێکی تایبەتی هەیە بۆ پەروەردەکردن و پێگەیاندنی کورد بە بیروباوەڕەکانی خۆی، کە پێیوایە خەباتی کوردو عەرەب بەیەکەوە یەک دووژمنیان هەیەو بەرژەوەندییان یەکە، لێکپچڕاندنی خەباتیان مانای زەرەردانە لە مەسەلەی هەردوو نەتەوەکە، پێویستی سەر شانی کوردە کە یەکێتیی نیشتمانیی عیراق بپارێزێت و پتەوی بکات، هەروەها ڕێگە نەدەین کە کوردستان و کورد جیابکرێتەوەو سەربەخۆبێت. ئەمە بڕوای بنەڕەتی حیزبی شیوعییە بەرامبەر بە مەسەلەی مافی کوردو کوردستان. سەرەڕای ئەوەی ئەم پارتە پارتێکی چینایەتی تایبەتە، لە بەرژەوەندی ئەو چینەوە دەڕوانێتە هەموو مەسەلەیەک، چ سیاسی بێت، یان قەومی، یان کۆمەڵایەتی و ئابووری... هتد.

ئێمە لێرەدا دەپرسین، ئایا بەرژەوەندیی داگیرکەرو داگیرکراو یەک بەرژەوەندین؟ ئایا بەدەستهێنانی مافی نەتەوەیی بە پتەوکردنی دەسەڵات و هێزی زەوتکەری ئەو مافانەیە، یان بە لاوازکردن و پووکانەوەیە؟

ئایا ڕزگارکردنی نەتەوەو نیشتمان بە خەباتکردنە بۆ زیاتر بەستنەوەی نیشتمان و نەتەوەکەمان بە عەرەب و ڕژێمی عەرەبی و داگیرکەرەکانییەوە؟ یاخود خەبات و تێکۆشانی سەربەخۆیی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردە دژی نەتەوەو ڕژێمە داگیرکەرەکان؟

ئەمانە خۆیان لەو ڕاستییە گێل دەکەن کە بەرژەوەندی (گورگ و مەڕ) یەک نییەو هەرگیز بەرژەوەندی و سوودی نەتەوەیەکی ژێردەست لەگەڵ نەتەوەیەکی داگیرکەر یەک نییە، چونکە نەتەوەی ژێردەستە دەبێت خەبات بکات بۆ دەرچوون لەژێر چنگی نەتەوەی داگیرکەرو بەدەستهێنانی ماف و چارەنووسی خۆی. لە هەمانکاتیشدا نەتەوەو ڕژێمە داگیرکەرەکە خەباتیان بۆ سەرکوتکردن و مانەوەی نەتەوە ژێردەستەکەیە بەداگیرکراویی و هەوڵدان بۆ تواندنەوەی قەوارەی نەتەوەیی، یان کوێرکردنەوەی ناونیشانیان، تەنانەت لەبیرکردنەوەی مێژووی نەتەوەو زمان و کەلەپوورو میرات و هەرشتێک کە پەیوەندی بە زیندووکردنەوەی گیانی نەتەوەییەوە هەبێت.

نەتەوەی کوردیش خەباتی بۆ پاراستن و قەوارەی نەتەوەیی و کوێر نەبوونەوەی ناوی کوردستان دەکات و بەدەستهێنانی مافی ڕەوای پێشێلکراوی، دەیەوێت وەکو نەتەوە داگیرکەرەکە لە نیشتمانی ئازادو سەربەخۆی خۆیدا بەئاسودەیی و سەربەخۆیی بژی و سود لە خێروبێری سامانی نەتەوەیی خۆی وەربگرێت و هاوکاریی بکات لە پێشکەوتن و سەرکەوتن بەرەوپێشەوەبردنی شارستانییەتی دونیادا. هەروەها بۆ بەهێزکردنی گیانی مرۆڤایەتی و خۆشبەختی و یەکسانیی نێوان نەتەوەکانی دونیا تێبکۆشێت.

ڕێڕەو و هەڵوێستی حزبی شیوعی پاش (شۆڕشی ١٤ی تەمموز) ئاشکراو ڕوونبووەوە، تەنانەت بەرامبەر چەند فشەمافێکی بچووکیش کردەوەی دوژمنانەی وایان دەکردو دەنواند، کە زۆر بەزوویی پەردە لەسەر ڕوویان هەڵمالڕا، زوو بۆ نیشتمانپەروەران دەرکەوتن کە لەژێر ناوی خزمەت بە کورد ئەم پارتە چ زەرەرو زیانێکی بە خەباتی نەتەوەی کورد دەگەیەنێت و چ ڕۆڵێکی هەیە بۆ مانەوەی کورد بە ژێردەستەیی.

تەنانەت بەرامبەر چەند مافێکی بچووکی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و پیشەیی، ئەم حزبە وەکو دوژمنێک لە سەنگەری دوژمنایەتیدا بەربەرەکانی ئەو فشەمافانەی دەکردو جێگای داخ و دڵگرانیش بوو کە شیوعییە کوردەکان بە جلوبەرگی کوردییەوەو بە زمانی کوردی بەبێئەوەی زەرەیەک هەستی نیشتمانی و نەتەوەییان بجوڵێنێت، بەرەنگاری کوردپەروەران دەوەستانەوە، کە بە (مصارفی کوردستانیان) ناویان دەبرا، چونکە دەیانوت (ئەمە زەرەرە لە یەکێتیی نیشتمانی و ڕێگا بۆ جیابوونەوە خۆش دەکات).

لە کۆنگرەی (یەکێتیی قوتابیانی کوردستان) ساڵی ١٩٥٩ کە خۆم ئەندامی کۆنگرەو نوێنەری بووم لەگەڵ نوێنەری (ئامادەیی سلێمانی و ئەمین عارف و گێلاس ڕەووف و موتەسەریفی سلێمانی و نوری سەعید)، هاوکات لەگەڵ چەند نوێنەرێکی دیکەی کوردستانییەکانی شاری هەولێر بۆ بەرەنگاربوونەوەیان دژی ئەو پێشنیارە کە کردبوویان، لە کۆبوونەوەکەدا داوامان کرد کە پشتگیری خەباتکەرانی کورد بکەن لە پارچەکانی دیکەی کوردستان بۆ ڕزگاری و سەربەخۆییان، بەڵام دژمان وەستانەوە، بەتایبەتی

دژی ڕێکخراوە کوردستانییەکان بەئاشکرا و بێ پێچوپەنا، بەتایبەتی دژی (پارتی دیموکراتی کوردستان)، کە لەو بەرەیەدا بوو پەیمانی لەگەڵ دەرکردبوون پاش ١٤ی تەمموز، پروپاگەندەیان دەکرد دژی پارتییەکان و ناوبردنیان بە ئەمریکی و پیاوی دەرەبەگ و بێگانە... هتد.

لەلایەکی ترەوە، لە سەرەتای شۆڕشی ١٤ی تەممووزدا کە شیوعییەکان دەسەڵاتداربوون، کەوتنە هاندانی (فەرماندەی فیرقەی ٢ی داود سلێمان جەنابی) بۆ گرتنی کوردپەروەرانی دەوری پارتی بەناوی گێرەشوێن و دوژمنانی کۆماری ١٤ی تەمموز، وەکو ئەم کوردپەروەرانە: (سەعید گەوهەر، ڕەشید فەرەج، حەمەی ڕەشە خێڵ، قالەی کۆلە شین و چەند کەسێکی تر...). لەلایەکی ترەوە پیلان و نەخشەیان دەکێشا بۆ پەلاماردانی ڕێکخراوە کوردستانییەکان و پارتییەکان، وەکو پەلامارەکەی شاری هەڵەبجەو زۆر شوێنی تری کوردستان، تەنانەت هەوڵدان بۆ ڕێگەگرتنیان لەو کەسانەی سەر بە شیوعی نەبوون بۆ دانەمەزراندنیان لە دەزگاکانی میریدا وەکو: (دائیرەکانی چارەسەرکردنی کشتوکاڵ و معاریف... هتد).

هەروەها بەرگریکردن لە خوێندنی زمانی (لاتینی) بەئاشکراو نووسین لەسەری، لەلایەکی ترەوە پیلاندانان بۆ گێرەشێوێنی لەسەری، بەتایبەتی پیلاندانان بۆ ڕیزەکانی پارتی بۆ بردنی ئەو حزبە بەلای نۆکەرایەتیی شیوعیداو دوورخستنەوەی لە نیشتمانپەروەری و مافە نەتەوەییەکان. وەکو ڕووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩ کە دەستەی (هەمزە عەبدوڵڵا، نەژادی ئەحمەد عەزیز ئاغا، قادری حاجی تاهیر کۆیی، فارس و لەتیف جگەرە، قادر میرزا کریم، شەهاب شێخ

نوری و عەبدول سۆران و هاورێکانی)، کە شیوعی کردبوونی بە دەست و پێوەندی خۆیان بۆ هەڵوەشاندنی پارتی و ڕێکخراوە کوردستانییەکان.

ئەوەبوو ئەمانە بەیانێکیان دەرکرد بە هەڵوەشاندنەوەی (ڕێکخراوە کوردستانییەکان)و بڕواهێنانیان بە سەرکردایەتیی حزبی شیوعی عێراق و بۆرجوازییەتی پارتی. حیزبی شیوعی هەموو کارەکەی ببوو بە بەربەرەکانیکردنی بیروباوەڕی کوردایەتی هەر لە ١٤ی تەممووزەوە تا هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١.

ئینجا با بێینە سەر ڕۆڵی حزبی شیوعی بەرامبەر شۆڕشی ئەیلوول، پاش دروستبوونی شۆڕشی ئەیلوولساڵی ١٩٦١، حزبی شیوعی بە لقی کوردستانیشەوە لە یەکەم ڕۆژی ئەم شۆڕشەوە لەکەمیندا بوون بۆ پووکانەوەو پوچەڵکردنەوەی شۆڕش، ئەویش بە پڕوپاگەندەو بڵاوکردنەوەی نووسین و گوتارەکانیان. شۆڕشی کوردیان ناو دەبرد بە (جوڵانەوەی دەرەبەگ و داخ لەدڵ و نۆکەرانی ئەمریکاو دژی وەستانی یاسای چارەسەری کشتوکاڵ)، لەلایەکی دیکەشەوە ڕژێمی عەبدولکەریم قاسمیان هاندەدا بۆ سەرکوتکردنی بۆئەوەی لەوە زیاتر پەرە نەسەنێت، بۆ ئەم مەبەستەش ئەفسەرە شیوعییەکان ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو بۆ هێرشهێنانە سەر شۆڕش و ناوچەکانی کوردستان بە فڕۆکەو تانک و تۆپەکانیانەوە.

هەروەها بەهۆی شیوعییەکان و ڕێکخستنەکانیانەوە لە ناوچەکانی (قەرەداغ، دەربەندیخان و چەند ناوچەیەکی هەولێر) ڕاپۆرتیان بەنهێنی دەنووسی بۆ دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات لەبارەی جموجۆڵی پێشمەرگەو کوردپەروەران، بەڵام کار لەکار ترازا بوو،

شیوعی ناسرابوو لەلایەن میللەت، لەبەرئەوە ڕۆژ بەڕۆژ خەڵک لە دەوری پارتی و بیروباوەڕی کوردایەتی و شۆڕش و پێشمەرگە کۆدەبوونەوە، ڕۆژ بەڕۆژ شۆڕش دەسەلاتی زیاتری دەکێشا بەسەر ناوچەکانی کوردستاندا، هێزەکانی ڕژێم خۆی بۆ نەدەگیرا لەبەر پەلامارەکانی پێشمەرگە، بۆیە حزبی شیوعی کەوتە گۆڕینی قەوانەکەو بەرزکردنەوەی دروشمی (ئاشتی کوردستان)، بۆئەوەی بەم هۆیەوە بتوانن بڕوای خەڵک زیندوو بکەنەوە بە شیوعی. هەروەها بۆئەوەی شیوعی دووربخەنەوە لە کەوتن و پووکانەوەو ئەو نووشستیانەی کە بەسەریاندا هات، چونکە سەرەتای دوورکەوتنەوەی خەڵک بوو، بەنموونە شیوعی لە هەڵبژاردنەکانی یەکێتیی جوتیاران و کرێکاران و قوتابیان و ئافرەتان و زۆربەی سەندیکا پیشەییەکان، هەر لە سەرەتای ساڵەکانی ١٩٦٠-ەوە بەرەو دەرنەچوون و تێکشکاندن ڕۆیشت، ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ بەرەی کوردایەتی و پتەوبوونی ڕێڕەوی نەتەوەیی. لەلایەکی ترەوە عەبدولکەریم قاسم لێیان تێگەیشتبوو، ئاگاداری مەبەست و نیازی جولانەوەکەشیان بوو، بۆیە ڕووی لێوەرگێڕان، ئەوەبوو مۆڵەتی حزبی شیوعی بە (داود صائغ و هاوڕێیەکانی)دا وەکو حزبێکی فەرمی ڕێگەی دامەزراندنی ڕۆژنامەی (مبدا)ی، دا بە (داود صائغ)، لەگەڵ ئەمانەشدا هێشتا سەرکردایەتیی حزبی شیوعی بەتەمای کورسی و جێگاو پێگە بوون لە ڕژێمی عەبدولکەریم قاسمدا.

مەبەست لە بەرزکردنەوەی دروشمی (ئاشتی لە کوردستان)دا وەکو وتمان تەنها بۆ ڕێگاگرتن بوو لە گەشەکردنی شۆڕش و بیروباوەڕی کوردایەتی و پاراستنی قەوارەی شیوعی لە پوکانەوە.

لەلایەکی ترەوە نەتەوەییە عەرەبەکان خەریکی جموجۆڵ و خۆئامادەکردن بوون بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم. حزبی شیوعی ترسێکی گەورەی لێنیشتبوو، چونکە دەیزانی بە ڕووخاندنی عەبدولکەریم قاسم لێدانێکی گەورە بەر ئەمان دەکەوێت، چونکە لە سەرەتای تەممووزدا دوژمنایەتی هەموو پارت و کۆڕو کۆمەڵە سیاسییەکانیان کردبوو، بەمجۆرە حزبی شیوعی هەڵسوکەوت و جموجۆڵیان دەکرد کە لەگەڵ مەسەلەی کوردو شۆڕش و مافەکانی تاوەکو ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣.

پاش ڕووخاندنی ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم بە (کودەتای ٨ی شوبات ١٩٦٣) و دەستگرتن بەسەر ڕژێمدا لەلایەن بەعس و نەتەوەییە عەرەبەکان بەیارمەتی دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات و یارمەتییەکانی دەوڵەتە ئیستعمارییەکانی ڕۆژئاواو ڕژێمە کۆنەپەرست و نۆکەرەکانیان لە ناوچەکەدا.

لە یەکەم ڕۆژی هاتنی (عەبدولسەلام و بەعس)، واتە بەعس و ئەفسەرە نەتەوەییەکانی عەرەب سەر بە عەبدولناسر لە ڕۆژی ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣، دروشمی لەناوبردنی شیوعییەکانیان هەڵگرت. زۆر لە سەرکردەو کادیرو ئەندامانی شیوعیان لەناوبردو بە دەیەهایان لێگرتن و خستیانە بەندیخانەکانیانەوە، یان بەرەو کوردستان ڕایانکردو خۆیان ڕزگارکرد لە گرتن و کوشتن لەژێر سایەی شۆڕش و پێشمەرگەو بارزانی و پارتیدا. هێرشی بەعس بۆ سەر شیوعییەکان ناوچەی کوردستانی نەگرتەوە، چونکە لە کوردستاندا پارتی و بارزانی و پێشمەرگە دەسەڵاتداربوون و ڕژێم بێ دەسەڵات بوو لە کوردستاندا.

کوردستان بووە مۆڵگەی خۆشاردنەوەی هەڵهاتووەکان لە زەبرو زۆرداری بەعس، دیارە بەهاتنی ئەم بارودۆخە نوێیە شکی تێدا نییە کە شیوعی دەبێت هەڵوێست و ڕێڕەوی سیاسی و دروشمەکانی خۆی بگۆڕێت کە بگونجێت لەگەڵ ئەوکاتەدا. بۆیە ئەو شۆڕش و پارت و پێشمەرگانەی لە پێشتر بە دەستکردی دەرەبەگ و پیاوانی ئەمریکا ناویان دەبردن لە پڕوپاگەندەو نووسینەکانیاندا بە (قودرەتی قادر) بوو بە شۆڕشی نەتەوەیەکی مافخوراوی نیشتمان دژی ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانی، پێویستە ئەم شۆڕشە مافی خۆی بەدەست بهێنێت بە مافی چارەنووسیشەوە. بارزانی بووە قارەمان و قاڵبووی شۆڕش و دژی ئەمریکاو ئینگلیز، هەروەها بە بارزانییان دەوت (ژەنەڕاڵ بارزانی، خاوەن بیروباوەڕ... هتد).

بەمجۆرە لە شۆڕش نزیکبوونەوە، بەتایبەتی لە بارزانی و مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەفسەرە شیوعییە ڕاکردووەکان جێگاو شوێنیان درایە لە کاروباری سەربازی و ئیداریی و ڕاهێناندا، پێشمەرگە باوەشی بۆکردنەوەو بە ئازادی لەمسەرو ئەوسەری کوردستاندا جموجۆڵیان دەکرد. ئەم فراوانیی ئازادییە وایلێکردن هەناسەیەک بدەن و خۆیان ڕێکبخەنەوە، زۆربەیان لە خۆیان بووغرا بوون، ئەوەیان لەبیرچووبوو کە تازە شیوعی ناتوانێت ئەو ڕۆڵە بگێڕێت کە لە سەرەتای ١٤ی تەممووزدا دەیانگێڕا، چونکە جەماوەری کورد لە ڕاستی و ناوەڕۆکی بیروباوەڕەکەیان تێگەیشتبوون، لەبەرئەوەی لە بەرەو هێزو پتەوبوونیان بتوانن جارێکی کە ڕۆڵێکیان هەبێت لەسەر شانۆی سیاسی. هاوکات ئەوەی لە ناوچەکەو عێراقدا لەژێر دەستی بەعسدا

بەسەریان هاتبوو، لە کوردستاندا زیندووی بکەنەوە، دروستکردنی دووبەرەکی و پیلان و نەخشەکێشانی بۆ دەسەڵات پەیداکردن لەناو شۆڕشداو لە ئەنجامدا دەستگرتن بەسەر شۆڕش و پێشمەرگەدا.

پارتی و شۆڕش ئاگاداری مەبەست و جموجۆڵەکانی شیوعییەکان بوون، بۆیە بەچاوی گومانەوە چاودێریی دەکران، شیوعیەکانیش بێ بیرکردنەوەو لەبەر نەشارەزاییان و غروورببوونیان بەو هێزەیانەوە کە دروستیان کردبوو. ویستیان بەرەنگاری شۆڕش و پێشمەرگەو پارتی بوەستن، بیریان لەوە نەکردبووەوە کە شۆڕشێک پارتی و پێشمەرگە توانیبێتیان بەرامبەر دەوڵەتێکی خاوەن سەربازو تازەترین چەک و جبەخانەو فرۆکەو تانک و تۆپ بوەستێت، مەحاڵە ئەمانە بتوانن بە قەد تاڵە موویێک لە شۆڕش کەم بکەنەوە، ئەوەبوو لە چەند کاتژمێرێکدا لە ناوچەکانی دەربەندیخان پێشمەرگە بە سەرکردایەتی (عەلی عەسکەری) پەلامارێکی کتوپڕی ئەو هێزەی شیوعییەکانیان داو تەفروتونایان کردن، ئەوەی کوژرا کوژراو، ئەوەی گیراش دیل کرا، هەندێکشی لە ئاوی دەربەندا بوونە خۆراکی ماسی ناو ئاوەکە. هەر بەهۆی ئەم ڕێڕەوە ناڕاست و نالەبارو هەڵانەی حزبی شیوعی، لەناوخۆشیان سەرەتای دووبەرەکییان دەرکەوتبوو. لەلایەکی تریشەوە ئەو ئێرانەی کە شیوعی جۆرەها نووسراویان لەسەر نووسیبوون، کەچی لە شۆڕشدا خواردن و هاوکارییان لێوەردەگرتن. تەنانەت لە ناوچەکانی بادینان و هەولێردا چەند شیوعییەک لەسەر ئەو تۆپانە بوون کە ئێران دابووی بە شۆڕش و سەربازگەکانی عێراقیان پێ بۆردوومان دەکردن. شیوعییەکان لەو کاتەدا بێدەنگ بوون لە کۆنەپەرستی

ئێران و نۆکەرایەتی بۆ ئەمریکا. پارمەتییەکانی ئێرانیان بۆ شۆڕش بە کارو کردەوەیەکی ئاسایی دەزانی و وەکو کردەوەیەکی مرۆڤانە لەقەڵەمیان دەدا.

ئەم شیوعییانە هەندێکیان لە ناوچەی (بارزان)دا پێشمەرگە بوون بە چەک و خواردن و کەلوپەلی پێشمەرگە دەژیان، تەنانەت زۆر پڕوپاگەندەیان دەکرد کە جێگاو دەسەڵاتیان هەیە لەناو شۆڕشدا. بەمجۆرە کات تێپەڕی تاوەکو کودەتەکەی (عەبدولسەلام و ئەفسەرە نەتەوەییەکان) بەسەر بەعسییەکاندا لە ١٨ی تشریندا. کارو کردەوەو ڕەوشتەکانی بەعس تەنانەت بە هاوکارەکانیان هەزم نەکرا، بۆیە (عەبدولسەلام و هاوڕێکانی) بەو کودەتایە بەعسیان لابرد لە دەسەڵات. پاش ئەمە نزیکبوونەوەیەک لەنێوان (عبدولسەلام و شورەوی)دا دروست بوو بەهۆی عەبدولناسرەوە، پاشان شیوعییەکانیش بە نزیکبوونەوەی شورەوی ئەمانیش لە عەبدولسەلام نزیکبوونەوە، تەنانەت عەبدولسەلام داوای لێکردن کە خۆیان بخەنە ناو (اتحادی اشتراکیەوە) بە دروستبوونی ئەو نزیکبوونەوەیە زۆری ئەو ئەفسەرو کاربەدەست و فەرمانبەرو کادیرە شیوعییەکان و ئەندامەکانیان گەڕانەوە ناو ڕژێمی عەبدولسەلام، ئەو حەماسەت و پشتگیرییانەی کە پێشتر هەیانبوو بۆ شۆڕشی کورد، کز بوون. پاشان هەوڵی ئەوەیان دەدا کە شۆڕش لەگەڵ عەبدولسەلام و ڕژێمەکەی ڕێکبکەوێت و کۆتایی بە شەڕو کوشتار بهێنرێت. بەمجۆرە هەڵوێستیان مامناوەندییانە بوو، لەنێوان ڕژێمی عەبدولسەلام و عەبدولڕەحمان و شۆڕشدا ڕەێڕەوی سیاسیشیان ڕوون و ئاشکرا نەبوو.

ورده ورده ناكۆكییەكانی ناوەوەی خۆشیان گەورەتر دەبوو لەنێوان سەركردەو كادیرو ئەندامە چالاكەكانیاندا، ئەوەبوو لە ئەنجامدا بوونە دووبەش بە ناوی (لیژنەی مەركەزی جەماعەتی عەزیز محەمەدو قیادەی مەركەزی، جەماعەتی عەزیز الحاج). ئەم دوو كۆمەڵە ڕاستەخۆ دژی ڕێڕەوی سیاسی و دروشم و هەڵوێستی یەكتربوون، هەروەها هەردوو كومەڵەكە پەیوەندییان بە شۆڕش و بارزانییەوە هەبوو. ئەم دوو بەشە هەندێک سەركردەو كادیرو ئەندامیان هەر لەناو شۆڕشدا مابوو. بەگشتی كاری گرنگی وایان نەبوو بۆ شۆڕش كە شایانی باسكردن بێت، بەمجۆرە لەگەڵ شۆڕش بوون تا بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠.

لە گفتوگۆكانی شۆڕش و بەعسدا داوا لە بەعس دەكرا كە وا بڕوانێتە حزبی شیوعی وەكو حزبێكی نیشتمانی و پەیوەندی لەگەڵدا بكات، هەرچەند بەعس لە دڵ و دەروونیدا ئەمەیانی پێخۆش نەبوو. تەنانەت لە كۆنگرەی هەشتەمی پارتیدا نوێنەری بەعس (محەمەد سلێمان چادری) كۆنگرەكەی بەجێهێشت، كاتێک نوێنەری حزبی شیوعی لە وتارەكەیدا هێرشی كردە سەر بەعس. ئەمە بوو بە خاڵێک دژی شۆڕش و پارتی و بارزانی، هەمیشە بەعس دووپاتی دەكردەوە لە ڕۆژنامەی (الثورە)دا. پاشان كە شیوعییەكان لە بەعس نزیكبوونەوەو بەعسیش بۆ مەبەستی خۆی زیاتر لە شورەوی و شیوعی نزیكبوونەوە بۆ هاندان و جوڵاندنیان دژی شۆڕش و پارتی و بارزانی و پێشمەرگە. تەنانەت پەیمانێكی دوو قۆڵییان دەركردو یەک دوو وەزیری شیوعی بۆ وەزارەت دانران.

شیوعی کەوتە پارەو چەک وەرگرتن لە بەعس و پڕوپاگەندەکردن دژی شۆڕش و پێشمەرگەو سەرکردەکان، هەروەها ناردنی شیوعی بۆ ناو ڕیزەکانی شۆڕش، بەمەبەستی ئاژاوە دروستکردن و کڕینی دەست و پێوەند بۆ بەعس، مۆڵەتی ڕۆژنامەی (طریق الشعب)و چەند گۆڤارێکی تر دراو پاشان شیوعی بوونە زوورناژەنی بەعس. دووبارە بەعس هەڵیخەڵەتاندنەوەو کردنی بە دوژمنی شۆڕش و پێشمەرگەو پارتی، بەیارمەتی فڕۆکەو تۆپ و تۆپخانەو چەکی قورس و دەبابە کەوتنە هێرش بۆ سەر ناوچەکانی پێشمەرگە لە دەربەندیخان، پاشان ئەوە بوو دیسانەوە ڕاوەدوو نران و کرانەوە بە مۆڵگەکانی سەربازانی ڕژێمی بەعسدا، بەڵام بەرەی (قیادە مەرکەزی) زۆربەی کادیرو سەرکردەکانیان بەعس گرتنی، هەندێکیان سەریان بۆ شۆڕ نەکردن و کوژران و هەندێکیان ئیعترافیان کرد بە (عزیز الحاج) وە بوونە ڕاوێژکارو فەرمانبەر. هەندێکیشان لە شۆڕشی کوردستاندا مانەوەو یارمەتی و ئازووقەیان و چەک و تەقەمەنییان لە شۆڕش وەردەگرت تا کۆتاییهاتنی شۆڕشی ئەیلوول. ئەمانە چەند پێشمەرگەیەکیان هاوکاری شۆڕشیان دەکردو لەسەر تۆپەکان بوون.

حزبی شیوعی لەکاتی شەڕکردنەوەی شۆڕش و بەعس لە ساڵی ١٩٧٤دا هاوکارییەکی باشی بەعسیان کرد، بەهەموو توانایەکیانەوە پڕوپاگەندەیان دەکرد دژی شۆڕش و پێشمەرگە لە ناوەوەی عێراق و کوردستان و دەرەوەی وڵات. تەنانەت لە دەوڵەتەکانی سەر بە شورەوی واتە (ڕووسیا)، ڕێگەی جموجۆڵ و پڕوپاگەندەیان دەگرت و خەباتی شۆڕشگێڕانی کوردیان قەدەغە دەکرد. ئەو کوردانەی

سەر بە شۆڕش و پێشمەرگەو بارزانی بوون لەو دەوڵەتانەدا، چاودێریی دەکران و تەنانەت هەندێکیان دوورخرانەوە.

بەمجۆرە بەعس توانی شیوعی تەفرە بدات و بە بەڵێنی درۆو پڕوپووچ سەریان لێبشێوێنێت و بیانکاتەوە بەگژ کوردو مافی کوردا. شیوعییەکان بێ ئەوەی ئەزموون وەربگرن بەعس خستنییە هەڵەیەکی گەورەو کوشندەوە. ئەو هێرشە گەورەو جەماوەرییەی کە ڕووی کردە ناو شۆڕش و بارزانی و پارتی و بەرەی کوردایەتی، دەبووایە بیریان لێ بکردایەوە، کە شۆڕش و پارتی و بارزانی و لە هەموو کات بەهێزترو پتەوترن، ڕیزی نەتەوەی کورد بە سەرکردایەتیی بارزانی بەئاسانی پارچە پارچە ناکرێت. ئەو بەڵێن و پەیمانەی شیوعی دابووی بە بەعس، کە جەماوەری کورد لە گەڵیدایە، هەمووی فشەو فیشاڵ و خەیاڵ بوو. بۆیە بەعس پاش ١١ مانگ شەڕکردن و بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێک، هیچیان بۆ نەکراو پاشان کەوتە پیلان و نەخشەی سەرشۆڕکردن بۆ ئێران و بەستنی پەیمانەکەی (جەزائیر).

پاشان پاش ئەو پەیمانەی جەزائیر بەعس کەوتەوە گیانی شیوعی و پشتگوێخستنی هەموو بەڵێن و پەیمانێک کە لەگەڵ شورەوەی و شیوعی کردبوویان. بەیەکجاری حزبی شیوعی پووکایەوەو ئەو جێگاو بروایەی نەما، بەو ڕێکەوتنە تاکتیکییەی بەعس هەموو ڕێکخستن و ئەندامەکانی شیوعی بۆ بەعس ئاشکرا بوون و بەعس لە ناوەوەیانەوە گەندەڵی کردن.

حزبی شیوعی پاش ڕێککەوتنەکەی جەزائیر ویستی ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە کە دروستبوو بەهۆی کارەساتی (کۆتاییهاتنی شۆڕشی

ئەیلوول)، ئەو بارە ناهەموارەی بەسەر (بەرەی کوردایەتیدا) هاتبوو، ئەنجامی پیلانەکەی جەزائیرە، کە جێبەجێکرا لە واشنتۆن و تاران و بەغداو ئەردەن و میسر نەخشەی بۆ کێشرا. بەعس شارەزاترو بەئەزموونتر بوو لە شیوعی، بۆیە زوو کەوتبووە سەروپۆتەڵاکی شیوعی و ڕێکخستن و ڕێکخراوەکانیانی پووچکردبووەوە، بە کڕین و دروستکردنی دەست و پێوەند لەناویاندا. ئەو مافەی لێسەندنەوە کە دەستی بەعسیان چزا بە ئاگری شەڕکردنەوەی ۱۹۷٤دا. کەوتە گرتنی شیوعی و (ئیستعمار) پڕکردنەوە پێیان. هەندێکیش کە سەریان شۆڕ نەکرد بۆ بەعس بەناوی تاوانی ڕێکخستنی سەربازی لەناو سوپادا (ڕەمی کردن) و لەسێدارەی دان. هەندێکی تریشیان بوونە فەرمانبەرو کاربەدەست بۆ بەعس، هەندێکی دیکەشیان سودیان لێوەرگرتن بۆ دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات و موخابەرات. ئەوە هەڵوێست و ڕۆڵی شیوعی بوو بەرامبەر مافی کوردو شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی ۱۹٦۱.

**- دیموکراتییەکانی عەرەب، مافی کوردو شۆڕشی ئەیلوول**

دیموکراتییە عەرەبەکان وەکو نوێنەری بەرەیەکی بۆرجوازی خاوەن بەرژەوەندی ئابووری و بازرگانی و شەڕو شۆڕو ناکۆکی و دووبەرەکییان لەلا پەسند نەبوو لەنێوان کوردو ڕژێمی عێراقدا. بۆ زیاتر پەرەپێدانی بازاڕو بازرگانی و دەستکەوت، لەلایەکی ترەوە ئەم بەرەیە سروشتەکەی ئاشتییانەیە بۆ کۆتاییهێنان بە بارودۆخی نائاسایی. بەرەی دیموکراتییەکان بریتیبوون لەو کەسانەی لە دەوری (پارتی نیشتمانی دیموکراتی) (کامل جادرچی) کۆبوونەوە، هەروەها (پارتی نیشتمانی پێشکەوتوو) ئەو بەشەی

(محەمەد حەدید) لەو پارتە جیاکردبووەوە لەگەڵ ئەو عەرەبە دیموکراتییانەی سەر بە عەبدولکەریم قاسم بوون، یان عەرەبە دیموکراتییە سەربەخۆکان، کە دەیانویست ڕژێمێکی دیموکراتی پەرلەمانی لە عێراقدا دروست ببێت. هەڵوێستی ئەمانە بەرامبەر مافی کوردو مەسەلەی کورد بریتیبوو لەوەی ئامۆژگاری کوردیان دەکرد کە لە هەندێک مافی زانیاری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و چەند سەربەستێک زیاتر داوای هیچی دیکە نەکەن، چونکە نەک (جەمال سفاحیان) لێ پەیدا ببێت. هاوکات ئامۆژگاری ڕژێمیان دەکرد، واتە (عەبدولکەریم قاسم) کە چەند فشەمافێکی بچووک لەبارەی خوێندن و زانیاری و ڕۆشنبیری و دامەزراندنی کورد لە دائیرەکانی بەڕێوەبەرایەتییەکانی کوردستاندا زەرەر ناگەیەنن و ئاسایش و ئاشتی و دیموکراتییەت دروست دەکەن. ئەمجۆرە داوایانە گران نین با مەسەلەکەیان گەورە نەبێت لە ئەنجامدا بەو مافە بچووکانەش ڕازی نەبن و بەرەو داوای گەورەو گرانتر بڕۆن. ئەم بەرەیە لە بیرکردنەوەدا بڕوایان بە سەربەخۆیی کوردستان نییەو تەنانەت کوردستان بە نیشتمانێکی جیاواز نازانن لە عێراقدا، لەبەرئەوە هەوڵ و کۆششیان بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕش بوو تا کۆتایی بە مەسەلەی کورد بهێنن.

**- عەرەبە نەتەوەییەکان و بەعس و مافی کوردو شۆڕشی ئەیلوول**

ئەم بەرەیە بریتییە لەو جوڵانەوە نەتەوەییانەی کە سەر بە (عەبدولناسرو سۆشیالیستەکانیان) بوون سەربەخۆکانیان و بەعس، ئەمانە لە سەرەتای شۆڕشی ١٤ی تەممووزەوە کوردیان بە شیوعی ناودەبرد، بەوەی لە نووسراوەکانی شیوعی و پارتیدا

دەیانخوێندەوە، هەروەها کوردیان بە دژی عەرەب و عروبایەتی و یەکێتیی عەرەب دەزانی، ئەمانە هەموویان دژی بەندی (٣) بوون کە لە دەستووری کاتیی عێراقدا (عەبدولکەریم قاسم) چەسپاندبووی. ئەم کارەی قاسمیان بە ناڕەوا دەزانی، تەنانەت دژی قاسم پڕوپاگەندەیان دەکرد کە گوایە کوردە.

ئەم بەرەیە بە واقیع ڕێرەوی سیاسی و فکرییان، هەروەها ڕووداوە سیاسییەکان و بارودۆخی هاتنی دەسەڵات بەسەر ڕژێمی عیراقدا، ئەو ڕاستییەیان سەلماند کە ئەمانە نانەتەوەیی و ڕەگەزپەرستن و هەڵوێست و بڕوایان بەرامبەر بە کورد داگیرکەرانەیە، تەنانەت (کوردیش بە میوان) دەزانن لەسەر خاکی عەرەب کوردستانیش بە بەشێک لە نیشتمانی عەرەب دەزانن. کردەوەکانیان نامرۆڤایەتی و بێڕەوشتییان بەرامبەر بە کوردو کوردستان بە ڕوون و ئاشکرایی هەقیقەتی ئەم بەرەیە دەسەلمێنن. بێ پێچوپەنا هەوڵی تواندنەوەو لەناوبردنی کوردیان دەدا لە بۆتەی عەرەبایەتیدا، قەڵاچۆکردنی کورد بە کۆمەڵ و هەوڵدانیان بۆ سڕینەوەی ناوی کوردستان، تەنانەت ڕزگار نەبوونی دارو درەخت و دەشت و دۆڵی کوردستان و وێرانکردن و فەوتاندنی، هەروەها پیسکردنی ئاووهەوای کوردستانیش.

ئەمانە دوژمنی هەموو جۆرە داواکاری و مافێکی کوردن ئەم جۆرانەیان دان بە هەر مافێکی نەتەوەییدا بنێن لە بێدەسەڵاتی و بێهێزییانە و هەر تۆزێک بەهێزبوون، مافی کورد پێشێل دەکەن. بێ مۆراڵی ئەمانە بەجۆرێکە هیچ لایان گرنگ نییە ڕەش بکەن بە سپی، پیاو بکەن بە عیسا بە موسا.

هەر لە هاتنی بەعس و نەتەوەییەکان وەکو (عەبدولسەلام و بەزازو تاهیر یەحیاو عەبدولعەزیز عقیلی) هەموو نەتەوەییەکانی دیکە دەسەلاتدار بوون لە ڕژێمدا، هەر لە ساڵی ١٩٦٣ تا هاتنی ساڵی ١٩٧٥ کۆتایی شۆڕشی ئەیلوول ئەم کۆمەڵە بە پیاوە ئاینییەکانیشیانەوە هەر کاتێک ناوی کورد بەرن بۆ تاکتیک و خەڵەتاندن و سەرلێشێواندنی کورد بووە، هاوکات ئەمانە لەناوبردنی قەوارەی نەتەوەییمان بە پێویستییەکی گرنگی نەتەوایەتی و مێژوویی خۆیان دەزانن.

کورد بە سەرچاوەی هەموو ناخۆشی و نەهامەتییەک دەزانن بۆ نەتەوەی عەرەب، لەبەرئەوە هەموو ڕێگەیەک دەگرنەبەر بۆ لەناوبردنی کورد، هەر چەکێک زۆر کۆشندەو کاریگەر بێت بەکاریدەهێنن. لەبەرئەوە بڕیارو فەرمانەکانیان و بەڵێن و پەیمانەکانیان کاتییەو بێبایەخن. ئەم بەعسە نەتەوەییانە هەر لە سەرەتای ١٤ی تەممووزەوە بە نووسین و نووسراوەکانیاندا ڕەگەزپەرستی خۆیان بەرامبەر کورد دەرخست، بەتایبەتی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی وەکو (الحرية، بغداد، فجر الجديد، الوادي، العراق، الثورة، الجماهير) دەیان نووسینی دیکە، بەئاشکرا کە کوردو عەرەبەو خاکی عەرەب لە ناوچەی پشکۆ دەستپێدەکات، واتە کوردستان خاکی عەرەبە.

پاشان (ڕۆژنامەی خەبات و گۆڤاری ڕۆژی نوێ و ڕۆژنامەی کوردستان و ڕوناهی) زۆر ئازایانەو چالاکانە بەرەنگاری ئەو نووسین و دەنگە ڕەگەزپەرستانە وەستان و وەڵامی تەواو و بەجێیان دانەوە، هەر لەسەر ئەم وەڵامدانەوەیە چەند جارێک

(رۆژنامەی خەبات) درا بە دادگاو داخستنی ئەو گۆڤارە کوردییانە.

- پارتی دیموکراتی کوردستان و مافی کوردو شۆڕشی ئەیلوول

ئەم پارتە لە ئابی ١٩٤٦دا دامەزرا، سروشتێکی تایبەتی هەیە، جۆری دروستبوونەکەشی وەکو پارتێکی ناوەڕاستڕەوی دیموکراتی بۆرجوازی بووە، چونکە دروستبوونەکەی لە جۆرەها کۆڕو کۆمەڵ و ڕێڕەوی سیاسی و کەسانی خاوەن بڕوای جۆربەجۆر دروست بووە. لەبەرئەوە پارتی ڕاستەوخۆ خۆی نەبەستووەتەوە بە هیچ بیروباوەڕێکی سیاسی و ئایدیولۆژیایەکی دیارو نەخشە بۆکێشراوی فکری، کە لە بارەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەلآیەتی و ئابووری نەتەوەکەمانەوە، هەڵهێنجراوی نە حزبێکی نەتەوەیی پێشکەوتخوازی مرۆڤایەتی کوردە، نە حزبێکی چینایەتی خاوەن فکری مارکسیە. بۆیە ئەم حزبە لە هەڵوێست و کردەوەوە خەباتی بەگوێرەی بارودۆخ و کات و چۆنێتی باری سیاسی ئەو کاتەو ڕووداوەکانی ڕێڕەوی سیاسی خۆی دیاریدەکات و دروشم بەرزدەکاتەوە.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، ڕۆڵی پارتی لە چواردەی تەممووزی ساڵی ١٩٥٨دا پارتی بەگوێرەی بێهێزیی پارتە سیاسییە (فکرییەکان) (نەتەوەیی، مارکسی) دروشمەکانی خۆی دیاری دەکرد. بۆ وێنە لە سەرەتای ١٤ی تەممووزدا کە شیوعییەت لە گەشەو بەهێزی و پەرەسەندا بوو، پارتی لەبەر بەرژەوەندی و سودی خۆی لەژێر ڕۆشنایی مارکسییەت دروشمەکانی بەرزدەکردەوە، تەنانەت لە زۆر کاتدا خۆیان بە گەلێک زیاتر بە شیوعی دەزانی لە شیوعییەکان ڕەسەنتر بوون، بەتایبەتی لە کۆبوونەوە جەماوەرییەکاندا. ئەندام و

لایەنگرانیان فێر دەکرد کە بڵێن (پارتەکەمان مارکسییە، پشتیوانی جمهورییە). تەنانەت شانازییان بەوەشەوە دەکرد کە سەرکردەو کادیرەکانی پارتی بە فەلسەفەی مارکسییەت ڕۆشنبیر دەکرد، تا گەیشتە ئەوەی لە ساڵی ١٩٥٩دا هەندێک کادیرو سەرکردەی پارتی وەکو (هەمزە عەبدوڵڵا)و دەست و پێوەندەکەی کە بەیان دەرکەن بە ئاشکراو بێ پێچوپەنا (ڕێکخراوە کوردستانییەکان حەل بکەن)، بڕوا بە سەرکردایەتی حزبی شیوعی بکەن و بۆرجوازییەتی پارتی دیموکراتی کوردستان بسەپێنن، بەڵام بەهۆی کوردپەروەرە نەتەوەییەکانی ناو پارتی، بڕیاری سەرکردەی پارتی (بارزانی) بڕیاریدا کە ئەو پیلانەی کۆلکە شیوعییەکان سەرنەگرێت، بڕیاردرا بە دوورخستنەوەی ئەوانە، پارتی وەکو جوڵانەوەیەکی کوردایەتی درێژە بە خەباتی خۆی بدات. ئەوەبوو لە بەتاوین کە بارەگای پارتی لە بەغدا لەو ناوچەی بوو، بەیاننامەی دەرکردنیان بڵاوکرایەوە، کە بەندە یەکێک بووم لەوانەی کە بەیانەکانمان لە بەغداوە هێنایەوە بۆ سلێمانی و بۆ بڵاوکردنەوەو هەڵواسینی بە شەقامی مەولەویدا. بەم ڕزگارکردنەی پارتی کوردە نەتەوەییەکانی ناو پارتی کەوتنە خۆ دروستکردنەوەی ڕێکخراوە کوردستانییەکان، ئەوە بوو من و چەند کوردپەروەرێکی تر لە نووسراو و ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا وەکو (ڕۆژنامەی خەبات و ڕۆژی نوێ)، کە بوونی ڕێکخراوە کوردستانییەکان وەکو قوتابیان و ئافرەتان و کرێکاران و جوتیاران... هتد بە چەند وتارێک وەکو پێویستییەکی مێژوویی لە نووسینەکاندا ڕوونمانکردەوە، وەکو (قادر شریف کوردەو نەوشیروان مستەفا ئەمین)، کە نووسەری سەرەکی ئەم نووسینانە

بوون. پاش تێکچوونی شۆڕش (نەوشیروان مستەفا ئەمین) لەگەڵ چەند کەسێکی تردا هەڵسان بە دروستکردنی (کۆمەڵەی مارکس لینینی). ئەمجارە پارتی بەرەو بەهێزبوونی بیروباوەڕی کوردایەتی هەنگاوی نا، تەنانەت کۆمەڵە نووسراوێک لە خەباتدا نووسرا کە بوونی حزبی شیوعی لە کوردستاندا زەرەردارەو سوودێک بە نەتەوەی کورد ناگەیەنێت، پاشان (بەهادین نوری) بە زنجیرە نووسراوێک لە (ئازاد)یدا وەڵامی ئەو نووسینانەی ئێمەی دەدایەوە، جموجۆڵی کوردایەتی لە پەرەسەندندا بوو. لەسەر دیوارو لافیتەکان ئەم دروشمانەیان دەنووسی (ئەو کوردە بۆ کورد تێکۆشێ، نەوەک بۆ کورسی گەل بفروشێ)، (پێشڕەوی کورد پارتییە، هیچ حزبێکی کە نییە)، پاشان ڕێکخراوە کوردستانییەکان دروستبوونەوە. پارتیش مۆڵەتی پێدرا لەلایەنی ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم لە ساڵی ١٩٦٠ لەسەر داوای بارزانی و نۆ ئەندامی سەرکردایەتیی پارتی و پەنجا لایەنگر ئەو پرۆگرام و پەیرەوەی پارتی نووسرا، بریتیبوو لەمانە: (خەبات بۆ پاریزگاری کۆماری عێراق، بەهێزکردن و قوڵکردنەوەو پتەوکردنی دیموکوراتییەت بۆ سەربەستی فەردی و دەربڕینی بیروڕاو، سەربەستی ڕۆژنامەگەری، ڕێکخستنی پارتایەتی و نیقابی، پاراستنی یەکێتیی نیشتمانیی عێراق، بەرگری لە دوژمنانی کۆماری عێراق، بەهێزکردنی چەکداری عێراق، پاراستنی ئاشتی جیهان، پێداگریکردن لە بڕیارەکانی باندونغ، بەهێزکردنی برایەتی کوردو عەرەب و کەمە نەتەوەییەکانی عێراق، دژی وەستانی جیابوونەوە لە عێراق، فراوانکردنی مافی نەتەوایەتی کورد لە چوارچێوەی عێراقدا). لەمجۆرە پارتانەدا یەکێتی بیروباوەڕ نییە،

هەر ئەندامە بەگوێرەی بیروباوەڕی خۆی و ڕێڕەوی سیاسی بڕواکەی بارودۆخەکە هەڵدەسەنگێنێت و هەڵویست دیاری دەکات و ماف و ئامانج دەستنیشان دەکات.

نەتەوەییەکانی ناو پارتی وایان بڵاودەکردەوە کە پارتی نەتەوەییەو بۆ ڕزگاری و سەربەخۆیی و یەکگرتنەوەی کوردو کوردستان خەبات دەکات. مارکسییەکانی ناو پارتی وەکو (موحەڕەم محەمەد ئەمین و هاوڕێیەکانی) مارکسییانە پارتیان هەڵدەسەنگاند. دیموکراتییەکانیش لە ناوەڕاستی ئەو دوو بیروباوەڕدا بوون، سەرەڕای ئەوەی کەسانی سوودپەرست و بەرژەوەندیویستی تایبەتی لە ڕیزەکانی پارتیدا بۆ سودی خۆیان هەڵسوکەوتیان دەکرد. تەنانەت لەمجۆرە حزبانەدا کەسانی سەر بە داگیرکەرو دوژمنیش جێگای خۆیان دەکردەوە، پارتی لە بەهێزبوون و پتەوکردن ئەزموونێکی گەورەی وەرگرت لە سەرۆکایەتیی بارزانیدا بۆ پارتی، هەر بەهۆی بارزانییەوە لە زۆر کەوتن و ناکۆکی و دووبەرەکیدا بەئاسانی و بێ زەرەر ڕزگاری دەبوو، زۆر تەنگوچەڵەمە بەناو و شۆرەتی بارزانی دەڕەوایەوە، هەمیشە لە پارتیدا بەرەی بارزانی سەرکەوتوو دەبوو.

هەر لە پاکردنەوەی مارکسییەکانی ساڵی ١٩٥٩ (هەمزەو هاوڕێکانی) تا دووبەرەکییەکەی ساڵی ١٩٦٤ مەکتەبی سیاسی. تەنانەت لە دروستکردنی لیژنەی مەرکەزی و مەکتەبی سیاسی و کۆنگرەو کۆبوونەوە فراوانەکانیدا ئەم ڕاستییانە بەزەقی دەبینرا.

لە هیچ کۆنگرەیەکی پارتیدا هەر لە کۆنگرەی پێنجەوە تا کۆنگرەی هەشت، کە خۆم تیایدا بەشداربووم و ئەندامی کۆنگرە بووم، نەتوانرا فەلسەفەو ئایدیۆلوژیاو بیروباوەڕی تێدا بە ڕوون

و ئاشکرایی دیاری بکرێت. پڕۆگرام و پەیڕەوییەکی سیاسی وەها گرنگی نەبوو تا نەخشەو سەرچاوەی خەباتی لێوە دیاری بکرێت. هەروەها پڕۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆکەی وەکو دامودەزگایەکی خزمەتگوزاری، وەک شارەوانی وابوو. دروستبوونی لیژنەی مەرکەزی لە کەسانی خاوەن بڕوای جۆربەجۆر لە مارکسییەک و نەتەوەییەک و دیموکراتییەکەوە هەتاوەکو بەرژەوەندپەرست و نەزان و بوودەڵەو نەخوێندەوار. جێگای هەموو کەسێک دەبوو لە پارتیدا، مەحسوبییەت و دروستکردنی دەستەو تاقم و دەستوپێوەند ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو. تەنانەت کەسانی تری حزبەکانی دیکە کە دەهاتنە پارتییەوە بێ قەیدوشەرت دەبوونە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی، واتە سەرکردایەتی، یان مەکتەبی سیاسی و لێپرسراوێتی گرنگیان پێدەدرا، وەکو (فاخر مێرگەسوری، د.سامی عەبدولڕەحمان، دارا تۆفیق،... هتد). تەنانەت کەسانی دیکەی بەرژەوەندیپەرست کە فریان بەسەر پارتایەتییەوە نەبوو، تەنانەت بەندێکی بچووکی پەیڕەو و پڕۆگرامیشیان نەدەزانی چییەو مەرجەکانی بوون بە پارتی و هاتنە ڕیزی پارتی کامانەن، کۆبوونەوە حزبییەکان چۆن دەبەسترێت وەکو (عەبدولوەهاب ئەتروشی، عەگید سدیق، ڕەشید سندی،... هتد)، هەروەها کەسانی نەخوێندەوارو نەزان و بوودەڵە لە وێنەی (عەبدول سۆران)و دەیانی تر. هەندێکیان دەیانوت ئەگەر هەڵمان نەبژێرن بۆ لیژنەی مەرکەزی، دەبینە جاش.

تەنانەت (حەبیب محەمەد کەریم) بەئاشکرا پێی لەو ڕاستییە دەناو هەموو کات ئەم وشەیەی دووبارە دەکردەوە (والله کاکه صدک، ماعدنا فلسفة ولا فکر، ماکو حزب نشتغل مثل ما نشتغل

بدائرة الحكومية). ئەمانە نموونەیەک بوون و مشتێک بوون لە خەروارێک. پاشان ئەمانە نوێنەرانی سەرکردایەتی حزبێک بن، چۆن نەتەوەی کورد تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە نابێت کە تووشی هات، چۆن لە تەنگوچەڵەمەو ناخۆشی و بەسەرهاتە ناهەموارەکانی سەر دەردەکات.

لەبەرئەوە زۆر کەم لە سەرکردایەتیی پارتیدا کەسانی ژیرو لێهاتوو و چالاک و پاک لێپرسراوێتی لە ئیشوکاری سیاسی و پارتایەتی و سەربازیدا پێدەدرا، بەقسەیان دەکراو گوێیان لێدەگیرا، چونکە بوودەڵەو هیچ لەباردا نەبووەکان ڕێگای ئەو جۆرە ژیرو چالاک و پاکانەیان نەدەدا، جۆرەها پیلان و ناو و ناتۆرەیان دوادەخستن، هەر بەنیازی دوورخستنەوەیان، لە زۆرکاتدا داگیرکەریان لێ هاندەدان. بۆ نموونە ڕووداوێکتان بۆ باس دەکەم کە خۆمی تێدابووم.

هەڵبژاردنەکەی (لیژنەی ناوچەی سلێمانی)، ساڵی ١٩٧٠ هەڵبژاردن بۆ دەستەی ناوچەو لقی چوار، کۆنگرەی هەشتەمی پارتی. بەگوێرەی کارکردن و لێهاتوویی و ژیریی، لیژنەی ناوچە لە کەسانێک هەڵبژێردرا کە هەموو خاوەنی ڕابردوو و خەبات بووین بۆ شۆڕش و پارتی و جوڵانەوەی کوردایەتی لە هەموو کاتە سەخت و ناهەموارەکانی خەباتدا ڕیزی کوردایەتی و پشتیوانی بۆ بارزانی و شۆڕشمان بەرنەداوەو چۆڵ نەکردووە. سەرەڕای ئەوەی جێگای ڕێزو متمانەی ئەندامان و لایەنگران پارتی و شۆڕش و بارزانی بووین، جگە لەوە هەندێکمان پێشتر لە سەرکردایەتی (کۆمەڵەی ئازادی و ژیانەوەی یەکێتیی کوردا)، واتە (کاژیک) ڕۆڵی گرنگمان هەبوو لە دروستکردنی چەندین گرووپی سیاسی

و ڕێکخراوی نەتەوەییداو دەستێکی باڵامان هەبووە، بۆ نموونە بەندە لەگەڵ کۆمەڵێ هاوبیری دڵسۆزدا لە چوار ڕێکخراودا دەستەی باڵای دارێژەری بنچینەیی بووین لە (یەکێتیی قوتابیان و لاوانی نەتەوەیی)، پاشان (پارتی گەلی تا دەگاتە کاژیک)، جگە لەوەی خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەری دوو ڕۆژنامە بە ناوەکانی (ڕابەرو چرای کوردستان)، تا دەگات بە بڵاوکردنەوەی چەندین وتارو نووسین لە ڕۆژنامەکانی پارتیدا، بەڵام بەداخەوە پاش هەڵبژاردنمان بۆ دەستەی ناوچەی سلێمانی و کۆنگرەی هەشت، بەزۆرینەی دەنگ، کە من یەکەم دەنگم هێنا لەگەڵ هەڤالانمدا، پاشان بە پیلان و نەخشەی (عەبدولی سۆران) چەند دەستوپێوەندێکی تر بە هاوکاری چەند ئەندامێکی لیژنەی مەرکەزی زۆر بەئاسانی و بێ گوێدانە هیچ پرنسیپێکی حزب و پەیڕەوی ناوخۆو پرۆگرام و هەست و سۆزی ئەندام و لایەنگرانی پارتی و دەنگدەرانی ناوچەو لقی چوار، بێ ڕێزگرتن لە خەباتی هەموومان لەناو شۆڕشدا، پاشان هەڤالانی دەرچوو لەناو ئەو لیژنەیەدا بڕیاری (دوورخستنەوە)یان دەرکرد بە بیانووی ئەوەی لیستی نەتەوەییەکان دەرچوون، زیاتر مەبەستیان لە هاوبیرانی (کاژیک) بوو، بەبێ هۆکار ئەو هەڤالانە بریتیبوون لەمانە: (تۆفیق نوری بەگ، فایەق عارف، ساجیدە خان، کامل ژیر، عەزیز شەفیق، کامل محەمەد ئەمین سەراج، ئەنوەر برزو)، هەندێک هاوبیری ترمان کە لە دەستەکەدا نەبوون، کاژیک بوون، ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لەکاتی پروپاگەندەکردن بۆ لیستی ئێمە لەکاتی کۆنفرانسدا، وەکو: (نەورۆزی مەلا عەلی، نوری شێخ کەریم، فەتاح حەمە ئەمین ئاغا، عومەر شەمەیی، جەمالی عومەر

ملوزم، شەهید شەریف مەولود، سەعەی گەوهەر، نوری حەمە عەلی، شێرکو بێکەس)، پاشان چەند کەسێکیان لە کاسەلێس و دەستوپێوەندەکانیان خستە ئەو لیژنەیەوە، بێئەوەی دەرچوو بن لە کۆنفراس و کرانە ئەندامی کۆنگرە، کاتێ ئەم کێشەیە گەیاندرایە سەرکردەکانی پارتی، تەنها (حەبیب محەمەد کەریم و دکتۆر مەحمود عوسمان و شێخ محەمەد هەرسین) نارەزاییان دەربڕیبوو لەو کردەوانەی (گرووپەکەی عەبدولی سۆران)، هەروەها هەڵوەشاندنی لیژنەی ناوچەو لیژنەکانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان لە سلێمانی و لیژنەی دانیشگای سلێمانی، بەو ئعتیبارەی ئەمانە سەریان بۆ بڕیارو فەرمانی تایبەتی (لقی٤) ی سلێمانی شۆڕ نەکردووە. (عەبدولی سۆران) هەمیشە ئەوەی دووبارە دەکردەوە کە بە هاتنی ئەمانە دەبێت ئەمانە بگەڕێنەوە، یان دووربخرێنەوە بۆ شوێنی کارکردنی خۆیان لەناو دەزگاکانی حکومەتدا. ئەمانە لەجیاتی دڵسۆزی ئەو نەتەوەییانە کە خاوەن بڕوای کوردایەتی بوون، کەوتنە کۆکردنەوەی کاسەلێس و بوودەڵەو دەست بەسنگەوەگرتن بۆ لیژنەکان، تەنانەت ئەمانە زۆریان پەیوەندییان بە دەزگاکانی ڕژێمەوە هەبوو لە ئەمن و ئیستخبارات، چونکە ڕۆژانی دوایی ئەو ڕاستییەیان سەلماند، جێگای داخ بوو کاتێک لە بارەگای بارزانییەوە بروسکە کرا تەنها بۆ گەڕانەوەی بەندە بۆ دەستەی لقی چوار بەبێ هاوبیرەکانم، بەڵام بەندە لە وەڵامی بروسکەکەدا ئەوەم ڕەتکردەوە کە بەتەنها من بگەڕێمەوە دەستەی لق بەبێ هاوبیرە دەرچووەکان، مەکتەبی سیاسی نەیاندەتوانی چارەسەری ئەو ڕووداوە بکەن، تەنانەت

ئەو نووسراو و یاداشتانەی ئێمەو هاوڕێیانم، کە خاوەن بڕوای دڵسۆزانەن، بە بەڵگەوە پێشکەشمان کرد، نەدەخوێنرانەوەو کاریان پێی نەکرا، تەنانەت لە کۆنگرەی هەشتەمدا.

تەنانەت پارتایەتی و دڵسۆزیی لای ئەو جۆرە بوودەڵەو نەزانانە ببووە کورسی وەرگرتن و خۆنزیککردنەوە لە بەعس و دامودەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات و موخابەرات بۆ قازانج و سودی تایبەتی. هەروەها بەئاشکرا (عەبدول سۆران)و گرووپەکەی ناوی دڵسۆزان و نەتەوەییەکانی ناو ڕیزی پارتی دابووە پاریزگای ئەوکاتەی سلێمانی بە ناوی (شکری حەدیسی) بۆ ناسین و لێدانیان، پاشان ئەوەبوو (شکری حەدیسی) ئەوانەی کە فەرمانبەر بوون لە بەڕێوەبەرایەتییەکاندا بە (لفت نظر) بەبێ هۆ ئیهانەی کردن و دەری دەکردن.

لەلایەکی ترەوە، بۆماوەی هەفتەیەک زیاتر ناوی ئەندام و لایەنگرانی حزب (کلیلی) بارەگای حزب لە لق دیار نەمابوو، دەرکەوت کە ئەندامە بەناو دڵسۆزەکانی سەر بە (لقی٤) لە شوێنی لیژنە دەرچووەکەی کۆنفراس، هێنابوویانن بۆ لیژنەی ناوچە، ناوەکانی ئێمەو کۆمەڵێ ئەندامی دڵسۆزی تریان تەسلیم بە دەزگاکانی ڕژێم کردبوو، پاش ئەوەی ئەمە گەیەنرایە سەرکردایەتیی پارتی و بارەگای بارزانی بۆ لێکۆڵینەوەو دۆزینەوەی تاوانبارو سزادان، کەسێک هەڵنەستا بە لێکۆڵینەوە لەو تاوانە گەورەیە، زۆر لەسەری نەڕۆین. ئەمە سروشتی پارتی و چۆنییەتی دروستبوونی پارتی بوو دیسان دەڵێم (ئەمە نموونەی مشتێکە لە خەروارێک).

- دروستبوونی شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١

وەک ئاماژەمان پێکرد شۆڕشی تەمموز ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە بووژاندنەوەی گیانی نیشتمانی و نەتەوەییدا، هەروەها ناساندنی ئەو ڕێڕەو و پارت و کۆڕو کۆمەڵانەی بەرامبەر مافی کورددا لەلایەکی تریشەوە تێگەیاندنی کوردو هۆشیاربوونەوەی و هەستکردن بەوەی کە کوردیش وەکو هەموو نەتەوەکانی دیکە مافی ڕەوای خۆیەتی بە ماف و ئامانج و ئاواتەکانی بگات. دیارە ئەوانەی دەستیان بەسەر مافی کوردا گرتووە، هەرگیز تا بۆیان بکرێت و بەهێزبن نە گوێ لە کورد دەگرن، نە بڕیاری دەستهەڵگرتن دەدەن لە چەوساندنەوەو زۆر لێکردن لە کوردو بردنی خێرو بێرو سامانی کوردستان. پاش ئەوەی بە پیلانی دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم کەوتە بەربەرەکانی مافی کورد. هەروەها زۆری دەزگاو دەسەڵاتدارەکانی سەربازی کە سەر بە بێگانەو بەکرێگیراو بوون، کەوتنە خۆکۆکردنەوە بۆ نانەوەی ئاژاوە دژی کوردو گێرەشێوێنی و هاندانی زیندووکردنەوەی دووژمنایەتی. بۆیە بارزانی ناچار کرد کە بگەڕێتەوە ناوچەی بارزان و بەوەش کۆڵیان لێنەدا، کەوتنە هاندانی ئەو سەرۆک خێڵانەی هەر بە زگماکی دژی جوڵانەوەی نەتەوەیی ئەندامانی پارتی و سەرکردەکانی و کادیرەکانی بوون.

هاوکات پڕچەککردنی دوژمنەکان کورد لە ناوچەی هەولێرو بادینان دژی کوردو بارزانی. لەبەرئەوە بارزانی ناچار بوو پارێزگاری لە کوردو ناوچەکەو مافەکانی کورد بکات، بۆیە بەرەنگاری هەموو ئەو هێرشانە بووەوە کە ئەو دوژمنانە بەهۆی بنکە سەربازییەکانەوە دەیانویست بۆ لەناوبردنی بارزانی و کورد بەئەنجامی بگەیەنن.

ئا لەم کاتەدا کە بارزانی بەرگری لە ناوچەکەو کوردو مافەکانی دەکرد، پارتی زۆر بێئاگابوو لەسەر بابەتەکەو تەنانەت نەشیدەویست تێوەبگلێت لەو بابەتە. بۆیە ئەندامە نەتەوەییەکانی ناو پارتی و کوردپەروەرانی نەتەوەی هەستیان بەوە کرد، کە ڕۆژی هەوڵ و هیمەتە و پشتگیری لە ڕەمزی شۆڕشی کوردایەتیی بارزانی کرد. بۆیە کەوتنە جموجۆڵ و کاری پێویست بۆ سوودوەرگرتن لەو هەست و سۆزەی خەڵکە دڵگەرمەکەی کوردستان و دروستکردنی یارمەتییەکی گرنگ بۆ بارزانی و شۆڕش و جۆلانەوەی کوردایەتی، بەم جموجۆڵە توانرا بەبێ ئاگاداری پارتی لە ناوچەکانی دەربەندی بازیان، دوکان، دەربەندیخان، مەرگەو ڕانیە، هەڵسان بە دروستکردنی جولانەوەیەک، ئەوەش بەیارمەتی چەند سەرۆک خێڵێک. پاش ئەوەی پارتی زانی کە خەریکە شۆڕش بەتین دەبوو و بەرەو بەهێزیی دەچێت، نوێنەری لیژنەی مەرکەزی ناردە ناو شۆڕشگێڕان و پەیوەندیکرد بەو ئەندامانەی پارتییەوە کە ڕۆڵیان هەبوو لە دروستکردنی شۆڕشەکەداو ئاگاداری کردن کە پارتی شۆڕشی نەکردووەو نایکات. ئەم هەستانە هی سەرۆک خێڵ و کەسانی تری بەرژەوەند لەدەستچووە، کاتێک ئەو ئەندامانەی پارتی و کوردپەروەران هەواڵی هەڵوێستی بارزانییان لە نوێنەری پارتی دەپرسی، بێدەنگ دەبوون و وەڵامیان بۆ نەدەدرایەوە. بۆیە ئەندامە کوردپەروەرو نەتەوەییەکان گوێیان لەو نوێنەرە نەگرت و تەنانەت نوێنەرەکەش بڕوای گۆڕدرا. پاشان لەبەرئەوەی لەڕاستیدا سەرکردایەتیی پارتی ئاگای لە شۆڕش نەبوو، بۆیە واشیان دەزانی کە بە چەند وشەیەکی نوێنەرەکەیان کۆتایی بەو شۆڕشە دێت و

ئەو ئەندام و کوردپەروەرانە دەگەڕێنەوەو گوێڕایەڵی هەموو بڕیارو فەرمانێکی پارتی دەبن.

پاش ئەوەی کە سەرکردەکانی پارتی زانییان کار لەکار ترازاوە، هەموو ئەندام و لایەنگرو کوردپەروەران لەگەڵ دروستبوونی شۆڕش بە دڵگەرمییەوە لە هاوکاری دروستبوونی شۆڕشدا بوون، هەر بۆیە بە ناچاریی چەند ئەندامێکی لیژنە مەرکەزی چوونە ناو شۆڕش بۆ وەرگرتنی جڵەوی کار. لەلایەن ئەندامان و کوردپەروەران پێشوازیی کران و یارمەتی دران لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ وەرگرتنی دەسەڵات و لێپرسراویێتی.

سەیر لەوەدایە پاش ئەوەی (سکرتێری ئەوکاتەی پارتی کە ئیبراهیم ئەحمەد) بوو، ویستی لە بەغداوە بگەڕێتەوە بۆ کوردستان، بەهۆی چەند کوردێکی نەتەوەیی کە لە ڕیزەکانی پارتیدا کاریان دەکرد، هێنرایەوە، بە جیبێکی ئەو کوردپەروەرانە، یەکێک بە ناوی (مهندس عبدوالوهاب البیاتی)، لە ڕێگە لەناو جیبەکەدا دەمانچەکەی دەردەهێنێت و فیشەکەکانی لێدەردەهێنێت. ئەو کوردە نەتەوەییە بەلایەوە سەیر دەبێت پێی دەڵێت مامۆستا با فیشەکەکان لە دەمانچەکەدا بێت باشترە، نەک تووشی نارەحەتییەک ببین، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت (نا، چونکە ئەگەر دەستبەسەرکرام با حوکمەکەم کەمتر بێت، چونکە دەلالەتی ئەوەیە کە بۆ بەکارهێنان ئامادەم نەکردووە).

ئەوە سکرتێری ئەو حزبەو شۆڕشگێڕییەتی سەرکردایەتییەکەی بوو، پاش ئەوەی ڕژێم کەوتە بۆردوومانکردنی ناوچەکانی کوردستان، بەتایبەتی ناوچەکانی بارزان، پەلاماری بارزانییەکان درا لەلایەن ڕژێم و نۆکەرانی، بارزانییەکانیش بەرەنگاریان بوونەوە بە سەرکردایەتیی

بارزانی خۆی. تێکشکاندنی هێزەکانی دوژمن وایکرد سەرکردەکانی پارتی ماوەیان بۆ نەمێنێتەوەو ناچار بە پاشەکشە کران.

پاش گەورەبوونی شۆڕش لە ناوچەی سۆران و دروستکردنی دامودەزگای سیاسی و سەربازیی و ئیدارییەکان لە ساڵی ١٩٦١ تا ١٩٦٤، مەکتەبی سیاسیی پارتی دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوا بوون، ڕاستەخۆ بەهۆی لق و ناوچەکان و ڕێکخراوەکانەوە هەموو کارو کردەوەیەک زۆر بەباشی و بێ گیروگرفت بەڕێوە دەچوو. خەڵکی کوردستان تینووی کردەوەی شۆڕشگێڕانە بوون، سەرەڕای گیانبەخشینی نەتەوەکەمان، کۆکردنەوەی کەلوپەل و خواردەمەنی و فیشەک و چەک تەقەمەنی، ببووە ئەرکی سەرشانیان، هەروەها بردنی ئەو پارانەی کوردپەروەران و ئەندامانی پارتی پێشکەشی شۆڕشیان دەکرد.

هەروەها پەلامارەکانی پێشمەرگە بۆ سەر مەخفەرو دەزگاکانی میری بەسەرکەتووانەو بەبێ زیان دەگەڕانەوە. ئەوەی ڕاستی بێت هەموو ئەندام و خەڵکی نەتەوەکەمان هەمیشە ئامادەی فەرمان و کردەوەی سیاسی و سەربازی بوون بۆ سوودی جۆلاندنی هەستی کوردایەتی بەهاوکاری و گیانفیدایی پێشمەرگەی سۆران و بادینان، زۆربەی زۆری ناوچەکانی کوردستانی خواروو ڕزگارکران. شۆڕش دەسەڵاتێکی گەورەو مەزنی پەیدا کرد، گیانبەخشین بەجۆرێک بوو لەناو کوردا، کە لە ناوەڕاستی شەقام و پێدەشتەکاندا دژی تانک و تۆپ و سەربازەکانی دوژمن دەبوونەوە بە گیانی پتەو و بڕوا بەخۆبوونەوە دەجەنگان، پێشمەرگە ڕووی بکردایە هەرلایەک دووژمن بە سەرشۆڕی دەشکاو ڕاوەدوو دەنران.

## بەشی پێنجەم
## بارزانی و پارتی دیموکراتی کوردستان

پێشتر ڕوونمان کردەوە کە پارتی سرووشتێکی تایبەتی هەیە، هەر لە چۆنێتی دروستبوونییەوە شێوازێکی تایبەتی هەیە، کە جۆرەها بیروباوەڕی جیاجیای تێدا کۆبووەتەوە. بوونی بارزانی لە سەرۆکایەتی ئەو حزبەدا، هەموو ئەو بیروڕاو ڕێڕەوە جیاجیانەی یەکخستبوو، هەروەها هەڵگرانی ئەو بیروباوەڕانە گوێڕایەڵی بڕیارو فەرمانەکانی بارزانی بوون، چونکە بارزانی وەکو خەباتگێڕو سەرکردەیەکی قاڵبووی شۆڕش بووە جێگای باوەڕو متمانەو هیوای کورد، هاوکات بە هیلاکی و عارەقی ناوچەوان و ئازارو ئەشکەنجەی ڕێگای خەباتی شۆڕشگێڕانەی خودی خۆی و بنەماڵەکەی ناونیشانی بۆ خۆی بەدەستهێنابوو، بە چەپڵەو مەحسوبییەت و لەسەر شانی کەس و بەدرۆو دەلەسە ئەو بڕواو متمانەیەی دروست نەکردبوو. تەنانەت کوردو زۆربەی زۆری ئەندامانی پارتی بەهۆی ناوبانگی بارزانییەوە لە دەوری پارتی کۆبوونەوە. بارزانی لە کۆبوونەوەو کۆنگرەکانی پارتیدا هەمیشە ئەوەی دووپات دەکردەوە کە (نوێنەری هەموو کوردە) خۆی بە براو باوکی هەمووان دەزانێت، بۆیە هەموو کۆڕو کۆمەڵ و پارتە سیاسییەکانیش بە چاوی ڕێزو شانازییەوە دەیانڕوانییە بارزانی و بڕیارو فەرمانەکانی.

تەنانەت داگیرکەرو دوژمنانیش زۆر چاک لە بارزانی گەیشتبوون، بۆیە هەموو هەوڵ و کۆشش و پیلان و نەخشەیان بۆ لەناوبردنی بارزانی بوو، لەڕێگەی ئەو مەبەستەدا بە ملیۆنەها دینار خەرجدەکرا

بە ئاشکراو نهێنی، بۆ لەناوبردن و دوورخستنەوەی بارزانی لە کوردو مەسەلەی کوردستان هەموو کارێک دەکرا. هەروەها چەند جار داوایان لێکرد کە (٨ ملیۆن دینار زیاتری بۆ تەرخان دەکرێت کە کوردستان بەجێبهێڵێت و لە یەکێک لە شارەکانی ئەوروپا نیشتەجێ بێت).

پاشان بارزانییەک کە قاڵبووی شۆڕش و شارەزای فڕوفێڵ و پیلانی دوژمنان بێت، هەمیشە سروشتی وابوو ئەزموونی تەجروبەکانی خۆی کە (گومانی هەبوو) لە بەرامبەر زۆر کەس، چونکە زۆر کەسانی ناڕاستی دەناسی و بەناوی نیشتمانپەروەرو بەرژەوەندی تایبەتی دەورەیان دابوو. هەروەها بارزانی لای هەموو کورد بەتایبەتی جوتیارو زەحمەتکێش، قوتابی و کاسب و ڕۆشنبیر، تەنانەت سەرۆک خێڵ و شاعیرو ئەدیبدۆستەکان و پیاوە ئاینییەکان جێگایەکی بەنرخ و تایبەتی هەبووە. سەرۆکێک بوو کە کەس نەیدەتوانی شان بدا لەشانی، سەرەڕای ئەوەی هەموو بیروباوەڕی ڕێڕەوە سیاسییەکان لەژێر باڵی بارزانیدا سەربەست و ئازاد بوون لە کردەوەو کارو جموجۆڵەکانیاندا.

تەنانەت بارزانی پشت و پەنای هەموو هەڵهاتوویەکی ئەو نیشتمانپەروەرانەی نەتەوەکانی تر بووە، وەک (عەرەب و تورک)، کە دوورخرابوونەوەو ڕاوەدوونراو بوون لە ڕژێمەکانیان، پارتیش لە یەکەم ڕۆژی دروستبوونییەوە شانازیی بە بارزانییەوە دەکرد، تەنانەت کاتێک بارزانی لە شورەویی بوو، جارجار وێنەیەکی بارزانییان نیشانی کوردپەروەران دەدا، کە گوایە بارزانی لە شورەوییەوە بۆی ناردوون.

لەنێوان ساڵەکانی ١٩٥٨-١٩٦١-١٩٦٤ پەیوەندییەکانی پارتی و بارزانی لە دابڕان و دوورکەوتنەوەو نزیکبوونەوەدا بوو، ئەم ڕاستییانە لە کۆبوونەوەو کۆنگرەکانی پارتیدا بەئاشکرا دەبینرا. بەتایبەتی لە کۆنگرەی پێنجەم کە بارزانی بەئاشکرا وتی نامەوێت سەرکردایەتیی پارتی بکەم. هەروەها لە ناکۆکی و دووبەرەکییەکانی ناو پارتیدا تەنانەت وەکو وتمان لەکاتی دروستبوونی شۆڕشی ئەیلوولدا، کە بارزانی هەڵمەتی دەبرد بەرەو (گەلی زاخۆ) و ناوچەکانی تری کوردستان، پەلاماری مەخفەرو سەربازگەو دامودەزگاکانی ڕژێمی دەدا. پارتی خۆی گێل دەکرد لە مەسەلەکەو بێدەنگ دەوەستان، نوێنەریان بۆ بڵاوەپێکردن بە شۆڕشگێڕان، پیلانیان سازو ئامادە دەکرد.

لە سەرەتای دروستبوونی شۆڕشەوە مەکتەبی سیاسی و بارزانی پەیوەندییەکی پتەو و ڕاستەخۆیان نەبوو، لووتبەرزیی سەرکردەکانی پارتی و بیرنەکردنەوەیان لە سروشتی دروستبوونی بارزانی وایلێکردن هەندێک کردەوەو هەڵوێست بنوێنن کە دووربێ لە بڕیاری بارزانی. لەو بارودۆخەدا بەندە بیرم لە دروستکردنی هێڵێکی تایبەتی لەگەڵ بارزانی و (حزبی دیموکراتی کوردستان-ئێران)دا کردەوە لە ڕێگای (ئەحمەد تۆفیق و برادەرانی وەکو کوردە نەتەوەییەکان)، کە لە ڕیزی (لاوان و قوتابیانی نەتەوەیی کوردا) کاریان دەکرد. بۆئەوەی بارزانی ڕاستەخۆ ئاگاداری هەواڵەکانی ناوچەی سۆران و هەڵوێستی مەکتەبی سیاسی و لێپرسراوانی پارتی بێت لە ناوچەی سلێمانی بەتایبەتی، توانیمان لە ڕێگەی ئەو هێڵە کە بەندە لەگەڵ بارەگای بارزانی و خودی بارزانی کاک

ئیدریس دروستمان کرد، هەواڵەکان بگەیەنین.

ئەو هێڵەی کە دروستمان کرد بە هاوکاری (ئەحمەد تۆفیقەوە) بوو، بەهۆی دۆست و نزیکی لە ئێمەوە دەتوانم بڵێم بلیمەتترین سەرکردە بوو لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا، پاشان ڕاستەخۆ پەیوەندی بە بارزانییەوە هەبوو، لە ناوچەی ماوەت و تەتەرێکمان بۆ دەستنیشانکرد لە هاوبیرێک لە ڕێکخستنەکانی ڕێکخراوەکەی ئێمەدا (لاوانی نەتەوەیی) کاری دەکرد. لەلایەکی ترەوە بۆ گەیاندنی دەنگوباسی ئەو ناوچانەی کە لەژێر دەسەڵاتی باڵی مەکتەبی سیاسیدا بوون، هاوکات هەواڵەکانی ژێر دەسەڵاتی بارزانی و (ئەحمەد تۆفیق و حزبی دیموکراتی کوردستان). لە هەمان کاتدا بە هاوکاری نەتەوەییەکان نووسراوێکمان دەردەکرد بەناوی (دیسان بارزانی) ئەم نووسین و بڵاوکراوانە ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو، ئەرکی ئەم نووسین و بڵاوکراوانە لەسەر شانی (نەتەوەییەکان ) بەڕێوە دەچوو. مەکتەبی سیاسی لەم کارانە بێئاگا نەبوون، تەنانەت چاودێرییان خستبووە سەر نەتەوەییەکان، ئێمەو برادەرانی (حزبی دیموکراتی کوردستان) چەند کەسێکیان لە هەردوولامان گرت، کە من خۆم یەکێک بووم لەو گیراوانە لە بەکرەجۆ دەستگیرکرام، بەڵام بەزوویی لەسەر داوای (بارزانی) ئازادیان کردین.

سەرەڕای ئەوە پارتی لە کۆبوونەوەکانیدا دژی نەتەوەییەکان پروپاگەندەیان بۆ دەکردین، کە ئەمانە (کورد کوژەن)، یان (انفصالین)، لەکاتی خۆیدا من بە چەند وتارێک لە (چرای کوردستان)دا کە لە (لاوانی نەتەوەیی) دەرمان دەکرد، وەڵامی چەند نووسراوێکی پارتیم دایەوە لەژێر ناونیشانی (کوردکوژە

کێیە)و جیابوونەوە (انفصالی) مانای چییە؟ ئەوەی ڕاستی بێت کە گرنگە ئاماژەی پێ بدەم (ئەحمەد تۆفیق، واتە عبدالله اسحاقی) ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو بۆ ئێمە وەکو نەتەوەییەکان، بەتایبەتی بۆ بەندەو نزیکبوونەوەم لە بارزانی، پاشان دروستکردنی پەیوەندی نێوان ئێمەو کاژیک کە لەسەر داواکاری ئێمە (ئەحمەد تۆفیق) توانی تەشکیلەی ئەو پەیوەندییەمان بۆ دروست بکات لەگەڵ بارزانی. هاوکات ڕۆڵێکی گەورەشی هەبوو بۆ خودی بارزانی خۆشی بە تەنها.

پارتی بێ ئاگاداری بارزانی لە ساڵی ١٩٦٢دا پەیوەندییان ئاشکرابوو بە دامودەزگاکانی ئێرانەوە، بە وەرگرتنی ئەو یارمەتییەی کە ٥٠ هەزار دینار بوو، سەرەڕای وەرگرتنی چەند یارمەتییەکی تری وەکو چەک و تەقەمەنی و ئازووقەو کەلوپەل، تەنانەت چەند کەسێکی مەکتەبی سیاسی نەبێت لیژنەی مەرکەزی ئاگاداری ئەم پەیوەندییانە نەبوون، بەمجۆرە تا کودەتاکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣.

ماف و ئامانج و داواکانی شۆڕش بەباشی نەنووسرابووەوە، نە لەلایەن پارتییەوە، نە لەلایەن بارزانییەوە بەتەواوی دیارینەکرابوو. نەخشەو پلانی بۆ نەکێشرابوو، هەر سەرکردەو کادیرو ئەندامێکی پارتی و شۆڕش لە بڕوای خۆیانەوە ئامانج و مەبەستیان دیاری دەکرد، نە مەکتەبی سیاسی دەیزانی داواکاری بارزانی چییە، نە بارزانی دەیزانی داواکاری مەکتەبی سیاسی چییە، ئەمە جۆری پەیوەندی نێوان بارزانی و پارتی بوو، بەتایبەتی مەکتەبی سیاسی لە دەرئەنجامدا گەورەترین دووبەرەکی دروستکرد لەنێوانیاندا.

## بەشی شەشەم
## ناکۆکی و دووبەرەکی نێوان بارزانی و
## مەکتەبی سیاسیی پارتی

هەر گرووپێکی سیاسی جۆرە سروشت و دروستبوونێکی تایبەتی هەیە، پارتی، پارتێکی خۆنەویست و سەر بە هیچ ڕێڕەوێکی سیاسی و بیروباوەڕێکی دیارکراو نەبووە. کۆبوونەوەکانی ڕیزەکانی پارتی هەریەک لە تەل و ئاوازێک دەیانخوێند.

بارزانی خاوەنی میراتێکی سیاسی و شۆڕشگێڕانە بوو، هەڵقولاوی ڕاپەڕین و بەرەنگاربوونەوەی دوژمنان بووە، بەتایبەتی لە ساڵەکانی ١٩٢٣-١٩٤٣-١٩٤٥-١٩٤٦ لە شۆڕشەکانی بارزان و بەشدارییەکی کاریگەری هەبووە، بەتایبەتی لەکاتی دامەزراندنی کۆماری مەهابادو هاوکاریی گرنگی بارزانی لەو کۆمارەدا پلەی (ژەنەڕاڵ)ی پێبەخشراوە.

ئەم دروستبوونەی بارزانی پێش دروستبوونی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە، کەواتە سەرۆکێک کە خاوەنی ڕابردوویەکی تێکوشانی (٣١) ساڵی ناخۆشی و بەرگەگرتنی بێت، زۆر ئەستەمە هەروا بەئاسانی بە پڕوپاگەندەیەکی بێ سەروبەرە لە سەرکردایەتی بخرێت و لە خۆشەویستی و چوونە دڵی کوردەوە بەئاسانی دەربهێنرێت. ئایا بە وشەیەک بارزانی کوردی بە چ دەستکەوتێکی تایبەتی فرۆشتووە، ناتوانرێت ئەو چاوبەستییە لە میللەت بکەیت کە مێژووی بارزانی چۆن بووە، لەکاتێکدا کە پارتی و سەرکردەکانی لەسەر ناوی بارزانی خۆیان بەهێزو قەڵەو دەکرد لە سەدا نەوەدی

ئەندامانی پارتی دوای بارزانی کەوتبوون، پاکی و ڕاستی و خۆڕاگریی بارزانی ببووە داستانێک کە زۆربەی خەڵکی کوردستان سوێندیان بەسەری بارزانی دەخوارد. سەرکردەیەک ماوەی زیاتر لە (٢٠) ساڵ پارتی بەشان و باڵی ئازایەتی هەڵیان دەدا، بەو جۆرە ناو دەبرا کە سەرکردەیەکی مێژوویی و نموونەی شۆڕشگێڕێتییە. چۆن لە چاوترووکانێکدا لەسەرکردایەتی دەکەوێت و بە خائین و کوردفرۆشی ناودەبرێت.

لەبەرئەوە مەکتەبی سیاسی کەوتنە هەڵەیەکی گەورەو نەتەوەی کوردیشیان بەخۆیانەوە دووچاری دووبەرەکی و ناکۆکی و کۆشتن و لەناوبردن کرد، کە تا ئێستاش پاشماوەکەی ڕۆڵێکی خراپی هەیە لەناو نەتەوەکەماندا. تەنها بە کۆنفرانسێکی چەند ئەندام و کادیرو سەرکردەیەک کە لە (ماوەت) بەسترا، چۆن دەتوانرێت بارزانی لە ناونیشان و کردەوەکانی دابماڵرێت و دووربخرێتەوە؟ ئەوەی ڕاستی بێت بارودۆخی ناکۆکی نێوان پارتی و بارزانی (ڕەگ و ڕەیشەیەکی) کۆنی هەیە.

لە نووسراوەکانی نەتەوەییەکاندا، بەتایبەتی (کاژیک)دا بەئاشکراو ڕوونی ڕێگای چارەکردنی ئەم دووبەرەکییەو ناکۆکییە چارەسەرمان بۆ دۆزیبووەوە. داوامانکرد بۆ ئەم مەسەلەیە کۆنگرەیەکی فراوان ببەسترێت کە دڵسۆزان و کوردپەروەرانیش ئامادەبن بۆ لێکۆڵینەوە لە هۆیەکانی ئەو ناکۆکییەی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی و هەرچییەکیان هەیە دژی یەکتر لەو کۆبوونەوەیەدا بیخنە ڕوو. پارتی واتە مەکتەبی سیاسی سەرکەرمی و غروورییان وایلێکردن بە هەڵە لە بارزانی بگەن، بۆیە وایاندەزانی بە (کۆنفرانسێک) لە بارزانی

ڕزگاریان دەبێت. چاوەڕوانی ئەوە نەبوون کە لەگەڵ سەرەتای دووبەرەکییەکەدا زووربەی زۆری پێشمەرگەو کوردپەروەران و ئەندامانی پارتی و سەرۆک خێڵ و کۆڕو کۆمەڵە سیاسییەکان پشتگیری بارزانییان کردو پاڵپشتی خۆیان بۆ بارزانی دووبارە کردەوە.

ئەوە بوو بارزانی بە یارمەتی کوردە نەتەوەییەکان و ئەندامەکانی پارتی و پێشمەرگە کەوتە خۆکۆکردنەوەو دروستکردنەوەی دامودەزگاکانی پارتی و یەکخستنی ڕیزەکانی پارتی و پێشمەرگە، ئەوەی ڕاستی بێت (نەتەوەییەکان) کە بەندە یەکێک بووم لەوانەو لە سەرپەرشتی لیژنەی تحضیری ئەندامانی سلێمانیدا بووم بۆ کۆنگرەی شەشەم. ڕۆڵێکی گرنگمان بینی بۆ دروستکردنەوەی پارتی بەتایبەتی لە سلێمانی و لەژێر ناوی (کاژیک)دا، کە پێشتر بۆ ئەم بابەتە بەندە دووجار لەگەڵ ئیدریس بارزانی لە گەڵاڵەو حاجی ئۆمەران کۆبووینەوە بۆ نەهێشتنی مانەوەی ئەو بۆشاییەی کە بەڕۆیشتنی مەکتەبی سیاسی و کادیرو ئەندامەکانیان دروستیان کردبوو.

بێگومان ئەم ڕۆڵ و یارمەتییەی نەتەوەییەکان بۆ بارزانی و دروستکردنەوەی پارتی لەبەر چەند هۆیەک بوو، کە پەیوەندی بە شۆڕش و بەهێزکردنی، لە بەشێکی تایبەتی لەم پەرتووکەدا بە ڕۆڵی (نەتەوەییەکان) باسی دەکەین. لەم نووسراوەدا بارزانی بە گرتنی کۆنگرەی شەشەمی پارتی لە ساڵی ١٩٦٤دا لە قەڵادزێ ڕۆڵی مەکتەبی سیاسی و دەستەو هاوکارەکانیان کەمکرایەوە لە شۆڕشدا.

هاوکات لە لایەکی ترەوە (مەکتەبی سیاسی) و هاوکارەکانیان وازیان نەهێناو کەوتنە جموجۆڵ و دژایەتی ڕاستەخۆ دژی بارزانی و شۆڕش و پارتی و پێشمەرگە، بۆ ئاژاوە نانەوەو تێکدانی ڕیزەکانی شۆڕش و پێشمەرگەو دەزگاکانی و بڵاوکردنەوەی دوودڵی و بێ بڕوایی لەناو کورداو دروستکردنی داروودەستە لەناو ڕیزەکانی پارتی و شۆڕش و پێشمەرگەو دەزگاکانی تریدا، بەمەبەستی ئاگاداربوونیان لە هەموو کارو چالاکییەکانی پارتی و بەنیازی دەسەڵات پەیداکردنەوە، بەڵام بە هاتنی بارزانی بۆ ناوچەی سۆران و سەرپەرشتی ڕاستەخۆی بۆ هەموو کاروبارێک، هەموو خەو و خەیاڵێکی مەکتەبی سیاسی پووچەڵ کردەوە، چونکە ڕاستییەکەی ئەوە ناشاردرێتەوە کە هیچ کورو کۆمەڵێک ناتوانێت بەرەنگاری بارزانی بوەستێ و بەبێ ڕازیبوونی ئەو لە شۆڕشدا بمێنێتەوە.

مەکتەبی سیاسی ئەو باروودۆخەیان پێ هەزم نەکرا، کە لە گەورەترین دەسەڵاتەوە بۆ دەستبەسەریی و چاودێریکردن و دوورکەوتنەوە لە لێپرسراوێتی و پشتبەردانیان لەلایەن ئەندام و پێشمەرگەو کوردپەروەران بۆیان. بۆیە بە نهێنی لە (دۆڵەڕەق) بەرەو ئێران ڕۆیشتن. لە دانیشتنێکدا کە بەندەو چەند کەسێک بووین خۆم ئامادە بووم لە بارزانیمان پرسی و وتمان بۆ (ڕێگەتان دان و نەتانگرتن)، ئەویش لە وەڵامدا وتی (ئەمانە وەکو پیسایی وان، دەستیان بۆ بەری بۆنیان زیاتر بڵاودەبێتەوەو دەستی خۆشت پیس دەکەیت).

مەکتەبی سیاسی پێش ڕۆیشتنیان بەرەو ئێران، هەرچی کەلوپەل و خواردنی وەک شەکرو چاو برنج و گەنم... هتد لەگەڵ ئەو

چەک و تەقەمەنییانەی کە بۆیان نەدەڕۆیی، دابەشیان کردبوو بەسەر دۆستەکانی خۆیاندا، بەمەستی هەڵگرتن و پاراستنیان بووە بۆ گەڕانەوەیان بە سەرکەوتوویی بەسەر بارزانیدا. هەروەها هانی هاوکارو دۆستەکانی خۆیان دابوو لە ڕیزەکانی پارتی و شۆڕش و پێشمەرگەدا کە سەرپێچی بکەن و لە ناوچەی ماوەت کۆیانکردبوونەوە. ئەمانە بە هاتنی بارزانی بۆ ناوچەی ماوەت بە پەلامارێکی کەمی خەڵکی ناوچەکە، کە تا دوێنی مەکتەبی سیاسی بەدۆستی خۆی دەزانین، کردنیان بە سنووری کوردستانی ئێراندا، تەنانەت زۆر پێشمەرگەی فریودراو گەڕانەوەو دڵسۆزی خۆیان بۆ بارزانی و شۆڕش نوێکردەوە. زۆر لەو شتانەی لە دێی (ئاوەکورتێ) حەشاردرابوون، لەلایەن جوتیارو دۆستانی شۆڕشەوە ئاگاداری لێپرسراوانیان کردو دەستیان بەسەردا گیراو دۆزرانەوە.

پاشان مەکتەبی سیاسی جارجارە بە هاندان و یارمەتییەکانی دەزگا سەربازی و ئەمنییەکانی ئێران لە سنوورەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە، چەند پەلامارو هێرشێکیان دەکردە سەر ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستانی خوارووی، کە لەژێر دەسەڵاتی شۆڕش و بارزانیدا بوون. تەنانەت پڕوپاگەندەیان بڵاودەکردەوە کە بەمزووانە بەسەر شۆڕشی بارزانیدا سەردەکەون و دەگەڕێنەوە، ئێرانیش بەهیوای ئەوەی بەهۆی ئەمانەوە بتوانێت بەمەبەستی خۆی بگات، یارمەتی دەدان بە پارەو چەک و ئازووقە... هتد.

ئێران ڕۆژ بەڕۆژ بۆی دەردەکەوت کە مەکتەبی سیاسی و گرووپەکەیان بەرەو پووکانەوە دەچن و هیچیان بۆ ئەنجام نادرێت، لەلایەکی ترەوە بارزانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەهێزترو پتەوتر دەبوو،

هەروەها ئەو هەڕەشەیەی بارزانی کە لە ڕژێمی ئێرانی کرد، کە ئەگەر بێت و یارمەتی مەکتەبی سیاسی نەبڕێت و ڕێگایان بدات لە سنوورەکانی کوردستانەوە پەلاماری ناوچەکە بدەن بە چەک و تەقەمەنی ئێران، ئەوە شۆڕش و پێشمەرگە ناچار دەبن کە شۆڕش بخەنە ناوچەکانی کوردستانی ئێرانەوەو بارەگاو دەزگا سەربازییەکانی ئێران بخەنە ژێر پەلاماری پێشمەرگە.

ئێران کەوتە چەککردنی مەکتەبی سیاسی و دوورخستنەوەیان لە سنوورەکانی کوردستان بەرەو هەمەدان و تەبرێزو تاران، پاشان ئێران بەپێچەوانەوە کەوتە نزیکبوونەوە لە بارزانی و ئەو یارمەتییانەی دەیدا بە مەکتەبی سیاسی، پاشان بەرەو بارزانی بەزیادەوە ڕەوانە دەکرا. مەکتەبی سیاسی کە بۆی ڕوونبووەوە لە (هەردوو جەژنە بووە)، ئەمجارە کەوتنە پەیوەندیکردن بە ڕژێمی بەغداوە بۆ گەڕانەوەیان و هاوکاریکردن لەگەڵ ڕژێمی عێراقدا، ئەوەبوو (عەبدولڕحمان بەزاز) پێشوازی لێکردن و لە تەلەفزیۆندا سەرقافڵەی کاروانەکەیان بەرەو عێراق نیشاندران.

مەکتەبی سیاسی و دەستەوتاقمەکەیان کەوتنە بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە کە گوایە خەباتی سیاسی دەکەن و خەباتی چەکداری لە بەرژەوەندی کوردا نییە، ڕژێمی عێراق یارمەتی دان و هەندێکیان گەڕاندنەوە سەرکارو فەرمانی خۆیان، هەندێکی تریشیان دامەزراندن و مووچەیان بۆ بڕینەوە.

بارزانی و هاوکارانی بە دروستبوونی بارۆدوخی دووبەرەکی و ناکۆکی پێویستی بەوە هەبوو جارێکی تر بۆ سەرلەنوێ تازەکردنەوەو ڕێکخستنەوەی دامودەزگاو ڕیزەکانی پارتی

و شۆڕش و پێشمەرگە، کۆنگرە ببەستێت. ئەوە بوو کۆنگرەی حەوتەم بەسترا لە ساڵی ١٩٦٦، لەم کۆنگرەیەدا زۆربەی زۆری لێپرسراوان و پێشمەرگەکان و ڕێکخستنەکان و ڕێکخراوەکان و کادیرەکان ئامادە بوون، لەم کۆنگرەیەدا لیژنەیەکی تازەی مەرکەزی هەڵبژێردرا کە لە کەسانی بیروباوەڕ جیاوازی سیاسی بوون لەناو شۆڕشدا، وەکو (د.سامی عەبدولڕحمان و دارا تۆفیق)، چەند کەسانی تریش کە بیروباوەڕیان جیاوازبوو لە ڕووی سیاسییەوە لێپرسراویێتی پێشمەرگەو کاروباری ئیداریی حزبیان پێ سپێردرا، بەڵام سیماو چۆنێتی دروستبوونی ئەم لیژنە مەرکەزییە هەروەکو لیژنە مەرکەزییە کۆنەکە وابوو، چونکە لە کەسانی بیروباوەڕ جیاوازەوە هاتبوون وەکو هەمان لیژنەی مەرکەزی پێشوو بوون.

لەم کات و بارودۆخەی شۆڕشی کورد پێیدا تێپەڕی لە ساڵی ١٩٦٦، دەتوانین ناوی بنێین کاتی بەرگریی لە شۆڕش و قەوارەی پێشمەرگە، چونکە گرووپی مەکتەبی سیاسی کە لەدوای ئەوە بە (جەلالییەکان و ناوی تر ناودەبران) بە توندی کەوتنە دژایەتی شۆڕشی بارزانی، تەنانەت پڕوپاگەندەیان بۆ پیاهەڵدانی ئەو سەرۆک خێڵانە دەکرد کە بە زگماکی دژی کوردو کوردایەتی و بارزانی بوون. دەیانوت ئەمانە دڵسۆزی کوردن، تەنها دژی بارزانین، بە لەناوبردنی بارزانی ئەمانە دەبنە شۆڕشگێرو پارێزەری مافی کورد؟ ئەمە چاوبەستێک بوو لە کوردی ساویلکەیان دەکرد، چونکە ئەم سەرۆک خێڵانەی ئەمان پێیانهەڵدەدان و پڕوپاگەندەی دڵسۆزیان بۆ دەکردن، لە هەموو زەمان و کات و بارودۆخێکدا نۆکەری داگیرکەرو ڕژێمە جۆربەجۆرەکانی عێراق بوون و

پێشەنگی هێرشەکانی دوژمنیان کردووە بۆ سەر کوردستان. لەکاتێکدا ناوچەی سۆران و بارزانیشی تێدا نەبووە زۆرجار هێرشیان کردووەتە سەر ناوچەکانی قەرەداغ و پێنجوێن، چوارتا، ڕانیە، ئەی بۆچی ئەم دڵسۆزانەی مەکتەبی سیاسی پێش سوپای داگیرکەر دەکەوتن و تاڵان و کوشتاری کوردیان دەکرد؟

بەبۆنەی ئەم کۆمەڵەیەوە مەکتەبی سیاسی کوردایەتییان لەبەر چاو بێزرابوو، تەنانەت دوژمنانی کوردایەتی بۆ سووککردنی بیروباوەڕی کوردایەتی ئەم (دەستەو تاقمە)ی بەنموونە دەهێنایەوە. کە ئەم سەرکردانە نموونەی کورسی ویست و بەرژەوەندیخوازو بۆرجوازی و بەکارهێنانی خوێن و عارەق ڕشتن و ماندوویێتی و هیلاکبوونی کورد بۆ سوودو گیرفانی خۆیان بەکار دەهێنا بەناوی کوردایەتیکردن.

هاوکات لەلایەکی ترەوە، بەئاشکرا شانبەشانی هێزەکانی داگیرکەر لە سوپاو جاش بەکرێگیراو بە چەک و تەقەمەنیی ڕژێم و بە هاوکاری تانک و تۆپ و فڕۆکەی دوژمن پەلاماری ناوچەکانی کوردستانیان دەداو هێرشیان بۆ سەر بنکەی پێشمەرگە دەکرد، کە پارێزگارییان لە شەرەف و ناموسی کورد دەکرد. ئەم گرووپەی کە پێیان دەوتن (جەلالییەکان) بەم کردەوەیەیان بووە هۆی شەهیدبوونی زۆر کوڕی کورد، کە داگیرکەرو دوژمن بە بیستنی ناوەکانیان لەرزیان لێدەهات. تەنانەت لە گرتنی قەرەداغ کە ئەمان چاوساغ و پێشەنگی جاش و سوپای داگیرکەر بوون کاتێک (مەهدی عەماش) مشتێ خۆڵی قەرەداغی هەڵگرتبوو لە وتارەکەیدا وتبووی (ئافەرین بۆ ئێوەی ئازا ئەی سەربازو سوارەکانی سەلاحەدین،

کە ئەم خاکەی عەرەبتان ڕزگارکرد)، ئەم کۆمەڵەیە دوژمنایەتییان وای لێکردبوون هەست و سۆزی گۆڕیبوون کە لەگەڵ خراپترین جاش و دوژمن هاوکاری بکەن. بیریان لەوە نەدەکردەوە کە بەم کردەوەیەیان کورد تووشی چ کارەساتێکی گەورەی لەناوبردن دەکەن لەو ئاگرەی ئەوان خۆشی دەکەن هەموو کورد دەسووتێنێت.

دەبێت ئەو ڕاستییە هەموو کوردێک بیزانێت کە کوردێکی ڕاستی خاوەن بڕوای کوردایەتی و نیشتمانپەرست، هەرگیز ڕێگا بەخۆی نادات هاوکاریی داگیرکەرو دوژمن بکات، چونکە بەم کارە زەرەر لە خۆت و لەناوبردنی نەتەوەکەت دەدەی، کەسانی نیشتمانپەروەر بۆ بەرژەوەندی و سوودی تایبەتی دژی نەتەوەو نیشتمان کرداری وا ناکات و دەست لەگەڵ هیچ دوژمنێک تێکەڵ ناکات بە بڕوبیانووی جۆربەجۆر.

داگیرکەرو دووژمنیش هەمیشە ئەو جۆرە کەسانە بە بێ نرخ و بێ ڕەوشت دەزانن کە دژی نەتەوەی خۆیان هاوکارییان بکەن. ئەوە بوو پاش ئەو هەموو خزمەتەیان بۆ ڕژێمی بەعس، پاش ڕێکەوتنی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ ئەم بەهەڵەدا چووانە بەرچاو تاریکانە وایان دەزانی بە پارەو پول و کورسی و پلەوپایەی بەعس و ڕێگادانیان بە دەرکردنی چەند ڕۆژنامەیەکی وەکو (النور) و (ڕزگاری)، کە بۆ دژایەتی شۆڕشی کورد ڕێگەیان درابوو، هەروا بەئاسانی بەو جۆرە دەمێننەوە.

ئەمانە جارجارەش لە نووسین و نووسراوەکانیاندا باسی (ماو) و ئامۆژگارییەکانی (ماویان) دەکرد، وایان نیشان دەدا کە ئەمانە ڕێڕەوێکی تازەیان گرتووە بۆ لەبیربردنەوەی خەڵکی کوردستان

لەو کردەوەو هەڵویستانەیان کە دژی شۆڕش هەیانبوو. تەنانەت من وتارێکم نارد بۆ ڕۆژنامەی (ڕزگاری)، کە تێیدا ڕوونم کردبووەوە ئەو کوردایەتییەی ئەوان ناوی دەبەن، بریتییە لە فشە کوردایەتی و خەڵک لەخشتەبردن. ئەوانیش بەگوێرەی بیروبۆچوونی سیاسی ئەو ڕۆژگارانەیان لەژێر ناونیشانی (نامەیەک و وەڵامێک) وەڵامی منیان دابووەوە.

تاڕێککەوتنی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ ئەمانە درێغییان نەکرد لە هاوکاریی ڕژێم، بەڵام بە تێکشکاندنیان لە ناوچەکانی سورداش و دوکانیان و مەرگەو دوکان و دوڵی شەهیدان و دەشتی هەولێر بەعس متمانەی پێیان نەماو ئەوەبوو پاش ڕێکەوتنەکە لەگەڵ بارزانیدا چەکی کردن و هەڵیوەشاندنەوە. بارزانی لەپێناو یەکێتیی کوردو یەکخستنی ڕیزەکانیدا چاوی لەو هەموو تاوان و کارو کردەوانەیان پۆشی و لێبووردنی گشتی بۆ دەرکردن (جەلالییەکانیش) بەیانێکیان دەرکردو بڕوایان هێنا کە ئەمانە (پارتی) نەبوون. خۆیان هەڵوەشاندەوە بە ناوی (حزبی شۆڕشگێڕ)، زۆریان گەڕانەوە ڕیزەکانی پارتی و هەندێکیشیان وازیان لە سیاسەت هێناو بوونە کاربەدەستی ڕژێم، بەمجۆرە کۆتایی پێهات بە دووبەرەکی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی.

پێویستە ئەو ڕاستییەش فەرامۆش نەکەین کە بەڕۆیشتنی ئەم گرووپەی مەکتەبی سیاسی بۆشایی دروست نەبوو، بەهۆی هاوکاری جموجۆڵی کوردە نەتەوەییەکانەوە زۆر سیاسی و کاربەدەستی کۆمەڵ و پارتە سیاسییەکانی تر دەیانویست هەل لەدەست نەدەن جێگای مەکتەبی سیاسی بگرنەوە، بەو نیازەی

دەسەڵات لە شۆڕش بگرنە دەست بۆ سوودی بیروباوەڕەکەیان لەژێر سایەی بارزانیدا، بەڵام هاوکاریی ئەندامە کوردپەروەرەکانی ناو پارتی و نەتەوەییەکان کە هەستیان بەو مەترسییە گەورەیە کرد، کە ئەگەر دەستپێشخەری نەکرێت و سنووریان بۆ دانەنرێت، ئەوا جوڵانەوەی کوردایەتی بێهێز دەکەن و بەرەو زەرەرو فەوتانی شۆڕش دەڕوات، بۆیە خێرا کۆنگرەی شەشەمیان بە بارزانی گرت و دامودەزگاکانی لق و ناوچەو ڕێکخراوەکانیان دروستکردەوە، بەتایبەتی ڕێکخراوە کوردستانییەکانی وەک قوتابیان و لاوان بۆ دوورخستنەوەی مەترسی بۆشایی دروستبوون و دەستتێوەردانی دوژمنانی کوردایەتی، لە لایەکی ترەوە زۆر هەلپەرست و بەرژەوەندیخوازو دوژمن بە پارتی و پارتایەتی و زۆر سەرۆک خێڵ و بەرژەوەندی تایبەتی و شەخسی کاسەلێسەکان و بوودەڵەکان نزیکبوونەوە لە پارتی و دەسەڵاتداری ناو شۆڕش. زۆر لەمانە لێپرسراوێتییان درایەو زۆر پارەو چەک و یارمەتییان لە بارزانی وەرگرت، پاشان دژی شۆڕش و بارزانی بەکاریان دەهێنایەوە بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی لەدەستچوویان. ئەم گرووپە مافی کوردو کوردستانیان مەبەست نەبوو، لە دڵ و دەروونندا دژی شۆڕش و بارزانی بوون. لەمانە زۆریان لەژێرەوە پەیوەندییان بە ڕژێمەوە کردبوو، وەکو (پشدەرییەکان)، کە پێیان سپێردرابوو لە پشتەوە لە شۆڕش بدەن. ئەوە بوو بە شەهیدکردنی (ئیبراهیم ئەفەندی) دەستیان ئاشکرابوو، کە دامودەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات چ ڕۆڵێکی هەیە لەناویاندا.

تەنانەت شۆڕش لە زۆر کاتدا بۆ هێشتنەوەی ئەو سەرۆک خێڵانەو

تێوەگلاندنیان و دوورخستنەوەیان لە داگیرکەر، لێپرسراوێتییان دەدانێ و دەیانکردن بە ئەندامی ئەنجومەنی شۆڕش و مەکتەبی تەنفیزی، بەڵام خەڵکانی خیانەتکار هەر بۆیان گونجا ڕووی ڕاستی خۆیان دەردەخەن، ئەوەبوو سەرۆک خێڵە پشدەرییەکان لەژێرەوە لەگەڵ ڕژێم ڕێککەتبوون کە ئەگەر کۆتایی بە یاسای چاکسازیی کشتوکاڵی بێنن، ئەوا دژی شۆڕش دەوەستنەوەو بۆ ڕژێم کار دەکەن، پاشان ڕژێم بەڵێنی درۆی پێدابوون. ئەمانیش سەلماندیان کە نۆکەری بەعسن و دژی شۆڕش وەستانەوەو چەکی خیانەتیان هەڵگرت، شۆڕش زەوی و ماڵ و سامانیانی دابەشکردن بەسەر جوتیارەکانداو ڕاوەدوونران بۆ لای ڕژێم و جەلالییەکان. هەروەها شۆڕش چەک و تەقەمەنی بەسەر جوتیارەکاندا دابەشکرد بۆ پارێزگاریی لە خۆیان. ئەمە نموونەی سەرۆک خێڵەکان بوو پاشان کەسانی دیکە لەدوای دووبەرەکییەکە لێپرسراوتییان درایە لە دەزگاکانی ڕژێمدا، دژی شۆڕش و پێشمەرگە لەدوای دووبەرەکیی بوونە لێپرسراوی شۆڕش و پارتی، وەکو (عەبدولوەهاب ئەتروشی)، هەروەها زۆرکەسی نەخوێندەوارو بەرژەوەندیپەرست بەهۆی دووبەرەکییەکەوە هاتنەوە ڕیزەوە، کە نەیاندەزانی شۆڕش و پارتی چییە؟

# بەشی حەوتەم
# کەوتنی ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم و
# هاتنی عەبدولسەلام و بەعس

بە شەڕی کوردستان ڕژێمی قاسم گەندەڵ بوو، مەودا فراوان بوو بۆ دوژمنەکانی قاسم لە بەعس و نەتەوەییە عەرەبەکان، کە یارمەتی دەدران لەلایەن دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات و موخابەراتی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان و ئەو ڕژێمانەی عەرەبی ناوچەکە کە سەر بە ڕۆژئاوا بوون و خەریکی پیلانگێڕان بوون دژی عەبدولکەریم قاسم و ڕژێمەکەی.

بە کودەتایەکی خوێناویی توانییان ڕژێمی قاسم لەناوبەرن و دەسەڵات بگرنەدەست و گەلێک خوێن لە شیوعی و دیموکراتییەکانی سەر بە قاسم بڕێژن. ئەفسەرە نەتەوەییەکانی سەر بە عەبدولسەلام و بەعس گەلێک شوێن و پلەی گرنگیان لە دەزگا سەربازییەکانی ڕژێم گرتە دەست. باسی کارو هەڵوێستی ئەمانەی کودەتای (٨ی شوباط)یان کرد لە ڕۆژی هاتنیان تا ١٨ی تشرین کاتی کودەتاکەی عەبدولسەلام و دوورخستنەوەی بەعس لە دەسەڵات.

ئێمە تەنها ئەو کارانەیان باس دەکەین کە پەیوەندییان بە مافی کوردو شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١-ەوە هەیە. بەعس و هاوکارانیان کەوتنە نزیکبوونەوە لە شۆڕشی کورد، زۆر بەڵێن و پەیمانیان دا کە مافی کورد لە چوارچێوەی عێراقدا دەپارێزن. ئەو مافەشیان دیاریکرد بە (ڕاگەیاندنی لامەرکەزی) کەوتنە نوێنەر ناردن بۆ بینینی نوێنەرانی شۆڕش، کە بەشێوەیەکی سەرەکی بریتیبوو لە

(جەلال تاڵەبانی)و نوێنەری بەعس جارێک (تاهر یەحیاو فواد عارف و عەلی حەیدەر سلێمان)، جارێکی کە (فایق سامەرائیی، حسێن جەمیل ، فیسەڵ حەبیب خەیزەران، محەمەد ڕەزا الشبیبی و عەزیز دوری، زید ئەحمەد عوسمان) لە کۆبوونەوەی ڕۆژی ١٩٦٣/٣/٧دا ئەم داواکارییانەی کوردیان وەرگرت، کە بریتی بوون لە:-

١- داننان بە مافی کورد لە (ئیدارەی ناوخۆیی)و چەسپاندنی لە دەستووری کاتی و هەمیشەییەکاندا، هەروەها دروستکردنی لیژنەیەکی هاوبەش بۆ ڕوونکردنەوەی جۆری ئەو (ئیدارە لامەرکەزییە).

٢- دەرکردنی لێخۆشبوونی گشتی.

٣- بەردانی بەندکراوەکان بەخێرایی.

٤- پاککردنەوەی دەزگاکانی میری لە پیاوخراپ و ئەوانەی زەرەریان لە کورد داوە.

٥-لابردنی حجزو دەستبەسەرداگرتنی ئەو کەس و ماڵ و کەلوپەلانەی کورد.

٦- بۆ سەلماندن و دڵنیایی و بڕواکردن بە ڕژێم، پێویستە بەزووترین کات هێزە سەربازییەکان بکشێنێتەوە لە کوردستان.

٧- دانانی ژمارەیەک وەزیر لە کوردو دانانی جێگری سەرۆک کۆمار لە کورد.

٨- لە کوردستان دەبێت سەربازەکان کورد بن.

٩- بەشێک لە دەستکەوتی نەوت دابنرێت بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان.

١٠- لە قوتابخانەکانی کوردستاندا خوێندن بە کوردی بێت و کەمەنەتەوەکانی تریش بە زمانی خۆیان لەپاڵ زمانی کوردیدا.

١١- دیاریکردنی ناوچەی کوردستان.

١٢- بژاردنی زەرەرو زیانەکان کە بەهۆی شەڕەوە لە کوردستان کەوتوون.

ئەم داوایانەی کورد بەعس بە بەڵێن و پەیمانی درۆو خۆخەڵەتاندن و وەختبردنە سەر گوێی خۆیانی لێ خەفاند. هەر لەم کاتەشدا بارزانی لەلایەن نەتەوەییەکانەوە چەند پێشنیارو بیرخەرەوەیەکیان پێشکەش کرد. ئێمە ئەوکاتە لە (لاوانی نەتەوەیی و کاژیک) بیرمان لە پلانێک کردەوە سەبارەت بە مەسەلەی دیاریکردنی ماف و ئەو داوایانەی کە پەیوەندییان هەیە بە هەموو کوردەوە. لەبەرئەوە پێشنیارمان کرد بۆ کۆبوونەوەیەکی فراوان، یان کۆنگرەیەک بۆ ئەم مەبەستە بگیرێت، کە تێیدا هەموو دڵسوزانی کورد ئامادەبن بۆ هاوبەشیکردن لە نەخشەکێشان و بڕیاردانی مافی کورد.

بارزانی داگیرکەری باش دەناسی کە خەریکی خۆخەڵەفاندن و تەفرەدان بوون، بۆیە بڕیاری دا ئەو کۆنگرە فراوانەی کە ئێمە نەخشەمان بۆ دەکێشا، بگیرێت بەهاوبەشی سەرکردەکانی ئەوکاتەی پارتی و دڵسۆزانی کوردو سەرۆک خێڵ و پیاوە ناودارو ئاینییەکان، تەنانەت لە کەمە نەتەوەییەکان کوردستانیش بەشدار بوون. بۆ زیاتر باسکردنی مافی کوردو بڕیارو مافەکانی، ئەوەی ڕاستی بێت کە پێویستە ئاماژەی پێ بدەم، ئەو پێشنیارەی ئێمە کردمان لە (کاژیک) هاوبیرانم دایان بە من کە بیگەیەنمە دەست بارزانی، منیش لە ڕێگەی ئەو پەیوەندییە تایبەت و بەهێزەی کە لەگەڵ (ئەحمەد تۆفیق)دا

هەمبوو، بەتایبەتی لە سەردەمانی دروستکردنی (لاوان و قوتابیانی نەتەوەیی و پارتی گەلی)، کە ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو، پێشنیارەکەی لێوەرگرتم و گەیاندییە دەست بارزانی. بۆ گرتنی ئەو کۆنگرەیە ئەوە بوو بارزانی بڕیاری بەستنی گۆنگرەکەی دا لە مانگی نیسانی ١٩٦٣داو لە شاری (کۆیە) گیرا، لەم کۆنگرەیەدا لەسەر داوای (ئەحمەد تۆفیق) کە بەندە بەشداریی بکەم، منیش داواکەیم قبوڵ کردو بەشدار بووم، هەموو ڕووداو و وتارەکانی ئەو کۆنگرەیەم تۆمار کرد بۆ ئەرشیف، پاش تەواوبوون کۆپییەکم لێ دا بە (ئەحمەد تۆفیق).

سەرەتا بارزانی یەکەم کەسێک بوو لەو کۆنگرەیەدا کە (لامەرکەزی) ڕەتکردەوەو گۆڕی بە (حکومی زاتی)، بۆیە بە بڕیاری ئەو کۆنگرەیە مافەکانی کورد بەمجۆرە نووسراو بە نووسراوێکی پارتی دیموکراتی کوردستان بڵاوکرایەوە.

١- (ولایەتی کوردستان) پێک بێت لە ئەنجومەنی جێبەجێکردن و ڕاپەڕاندن بۆ (اقلیمی کوردستان) یان ولایەتی کوردستان، یان ناوچەی کوردستان لەم وەزارەتانە دروست بکرێت.

ا- معارف (زانیاری).

ب- الصحة (تەندروستی).

پ- ناوخۆ.

ت-اشغال واسکان (کارو نیشتەجێکردن).

ج- چارەسەرکردنی کشتوکاڵ.

چ- کاروباری کۆمەڵایەتی.

ح- شارەوانی.

خ- کاروباری ئابووری.

لەبەرئەوەی هەندێک لەم وەزارەتانە کاروباریان وەکو یەکەو لە یەکەوە نزیکن، دەتوانرێت لە وەزارەتێکدا ڕێکبخرێن، بەڵام وەزارەتی بەرگریی مەرکەزییە، وەکیل وەزیر دەبێت کورد بێت لەگەڵ نائیب سەرۆک ئەرکان. لە کوردستاندا سوپا بەناوی کوردستانەوە بێت، لە بەشی نەوت و باج و دەستکەتەکانی ڕەسم و گومرگ بەشی هەبێت. جێگری سەرۆک کۆمار کورد بێت، مافی کەمە نەتەوەییەکان لە ڕۆشنبیری و زانیاری کۆمەڵایەتی و ئابووری بپارێزێت، وەکو تورکمانەکان و ئەرمەن و ئاشوری. بەعس لەولاوە بۆ کاتبردنەسەر خۆیان خەریککرد بە گفتوگۆی یەکێتیی عەرەبەوە، بەینی سوریەو میسرو عێراق. لە هەمانکاتدا (حرس قومی) کەوتبوونە گیانی کوردەکانی (کەرکوک و موسڵ) و دەوروبەرەکانیان و دوورخستنەوەیان و لەناوبردنیان. هەر لەم کاتەدا ڕێگەی (جەلال تاڵەبانی) درا بۆ هاوبەشیکردن لەگەڵ نوێنەری بەعس و ڕۆیشتن بۆ قاهیرە بەبۆنەی یادی (یەکێتیی میسرو سوریا).

تاڵەبانی لەو چوونەدا گەلێک ڕاستی و واقع و ماف و داوای کوردی بۆ ڕۆژنامەو نووسەرە عەرەبەکان و لێپرسراوانی میسری ڕوونکردبووەوە. لەوانە مافی عەرەب، بەمەرجێک کوردیش مافەکانی خۆی دەستگیر بێت، بۆ زیاتر پتەوکردنی برایەتی کوردو عەرەب، هەر لەو ماوەیەشدا بەگوێرەی نووسراوەکانی پارتی، یان داوای بارزانی وەکو سەرۆکی نوێنەرانی کورد کە (تاڵەبانی) بوو، زۆر خاڵ زیاد دەکراو زۆر بەندی تازە ڕوون دەکرایەوە بۆ بەعس، یان بە نووسین، یان بە وتووێژ.

لەڕاستیدا ئەم داوایانە بچووکترین مافی ڕەواو مافی کورد بوو، بەڵام بەعس بۆ کاتبردنەسەرو گەڕان بەدوای هەلومەرجی لەبار بۆ بەهێزکردنی خۆی پاککردنەوەی دەزگاکانی سوپاو ڕژێم و خۆ ئامادەکردن بۆ کات و بارودۆخی لەبار، بۆ هێرشهێنانە سەر کورد هەر خەریکی دەستی دەستی بوون. دەبێ ئەوەش بزانین کە شۆڕش و پارتی و پێشمەرگەو بارزانی ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو بەهێزبوون دەچوون، زیاتر کورد بڕوای پەیدا دەکرد بە سەرکەوتن و ژێرکەوتنی دوژمن، تەنانەت باری (مەعنەوی) ئەندام و کوردپەروەران بەجۆرێک بوو کە تەمەننای شەهیدبوونیان دەکرد لە پارێزگاری کوردستان و قەوارەی نەتەوەیی و بەدەستهێنانی مافی کورد.

٢- پاش ئەوەی شۆڕش زۆری بۆ بەعس هێنا، کە پێویستە وەڵامی داواکانی شۆڕش بداتەوە، بەعس ناچار بوو لیژنەیەک پێکبهێنێت بۆ دانانی پرۆژەیەک، کە هەموو عێراق بگرێتەوە بە کوردستانیشەوە، پرۆژەکە بەناو بۆ چارەسەری کێشەی کورد بوو، داوای لەو لیژنەیە کرد کە پرۆژەی (لامەرکەزی) بۆ هەموو عێراق دابنێت، ئەو لیژنەیەش لەمانە پێکهاتبوون:

١- ساڵح مەهدی عەماش، وەزیری بەرگری.

٢- ناجی تالب، وەزیری صناعە.

٣- مەحمود خەطاب، وەزیری بلدیات.

٤- حازم جەواد، وەزیری خارجیە.

٥- مەهدی دەلوعی، وەزیری داد.

٦- محمد رەزا الشبیبی، فایەق سامرائی، حسین جمیل، عبدالعزیز دوری، علی حیدر سلیمان.

ئەم لیژنەیە پرۆژەیەکیان دانا کە بەهیچ جۆرێک مافی کوردی تێدا دیاری نەکرابوو، تەنانەت مادەی (٣)ی دەستووری کاتیشیان سڕیبووەوە. بەعسیش کەوتبووە شەڕفرۆشتن بە کورد، وای بۆچووبوون کە بەزووترین کات بەسەر کوردا سەردەکەون، بۆیە لە ڕۆژی ١٩٦٣/٦/١٠ بە فەرمی (بەیانی شەڕکردنەوەیان) دەرکردو کەوتنە هێرشی سەربازی بۆ سەر کوردستان. تەنانەت ناو شارە گەورەکانی کوردستانیش لەو هێرشەدا بێبەش نەکران بە وێرانکردن و ڕووخاندن و تالانکردنی، سەرەڕای ئەوەی هەموو جۆرە چەکێکی جەنگی تازەیان بەکارهێنا، هەر لە فڕۆکەو تۆپ و تانک و دەبابەو چەکە قورسەکان. زۆر گەڕەک و ناوچەی موسڵ و کەرکوک و دەوروبەرەکەیان وێرانکرد، لەگەڵ ئەوەشدا گرتن و کوشتنی بەکۆمەڵ لەناو شارەکانی سلێمانی، کەرکوک، هەولێر، دهۆک و موسڵ. بەسەدەها کوردیان بە زیندوویی دەکردە ژێر خاکەوە، کارەساتەکەی دۆڵی شەهیدان لە سلێمانی و شارەکانی کوردستان شاهیدی ئەو کردەوەیەی بەعسن.

تەنانەت بەعس بە خۆشیان ڕازی نەبوون، سوپای سووریشیان هێنایە سەر کوردستان، بەڵام بەهۆی هێزو تواناو چالاکی و ئازایەتی پێشمەرگەی کوردستانەوە لە هەموو بەرەکانی شەڕدا داگیرکەر بەرەو شکان و بە سەرشۆڕی هەڵد هاتن، ئەم بێ ڕەوشتانە لەوە زیاترخەڵکی بە کۆمەڵی ناو شارەکانیان بەزیندوویی دەکرد بەژێر خاکەوە، سەرکەوتنێکی بچووکیشیان بەدەست نەهێنا کە باری مەعنەوییان بەرزبکاتەوە. هەر لەم شەڕەی ئەمجارەیان بۆ سەر کوردستان، جاش و حەرەس قەومییەکی زۆری بێ شوماریان هێنابوو بۆ یارمەتییان.

بەهۆی ئەم هێرشانەیان بۆ کوردستان ناکۆکییەکانی نێوان خۆیان کەوتنە ڕوو، سەرەڕای ناکۆکی نێوان ئەفسەرە نەتەوەییەکان بە سەرکردایەتیی عەبدولسەلام لەگەڵ بەعس و ئەو ئەفسەرو خاوەن دەسەڵاتانەی هەمیشە چاویان لە گیرفان پڕکردن بوو لەسەر حسابی میللەت. لەلایەکی ترەوە بێ ڕەوشتی بەعس و کرداری خراپیان کە لە عێراقدا دەنگی دابووەوە، لەگەڵ کارو کردەوەی حەرەس قەومی وای لە میللەت کردبوو کە ڕۆژێ زووتر چاوەڕێی کەوتنیان بوون. زۆر لە ئەفسەرە نەتەوەییەکان بە سەرکردایەتی (عەبدولسەلام) لەگەڵ ئەفسەری تری بێلایەن لەگەڵیان بوون بۆ هەڵمەت بردن و خستنی بەعس. بۆیە بەعسییەکان لە شەڕی کوردستانەوە تێوەگلابوون، ئەمە وایکرد زووتر لەناوبردنیان ئاسانتر بێت لە دەسەڵات لێسەندنەوەیان.

لەلایەکی ترەوە، دارایی و خەزێنەی دەوڵەت خاڵیی ببوو، تەنانەت سەر نەویکردنی بەعس بۆ کوێت بەرامبەر ئەو ٣٠ ملیۆن دینارەی کە وەریانگرت بەکەڵکیان نەهات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو یارمەتییانەی دەزگاکانی موخابەراتی ڕۆژئاواییەکان بۆ بەعس و سەرکردەکانیان بۆیان ڕەوانە دەکردن. درووشمە ساختەکارییەکانیان لە (ئازادی سۆشیالیستی و یەکێتیی دادپەروەری) هەمووی چاو بەستەکی بوو، بۆ سودو بەرژەوەندی و مانەوەو هەڵخەڵەتاندنی خەڵک. زۆربەی سەرکردەکانیان پیاوی دەزگاکانی موخابەراتی دەوڵەتە گەورەو ڕۆژئاواییەکان بوون.

تەنانەت لە کەوتنەکانیشیاندا بچووکترین زەرەر ناکەن، چونکە بەرگری پێشمەرگەی کۆڵنەدەرو ئازاو پەلامارەکانیان بۆ سەر

هێزەکانی بەعس، نزیکبوونەوە لە کەوتنی دەسەڵات. ئەوەبوو لەسەر میرات بەشکردن بەعسییەکان کەوتنە گیانی یەکتری و خەریکی کۆکردنەوەی پارەو ناردنی بوون بۆ بانقەکانی ڕۆژئاوا بۆ مسۆگەرکردنی دوارۆژی خۆیان، ئەوەندە خراپەکاری و بێڕەوشتییان کرد خۆیان دەیانزانی لەچ زەلکاوێکدا دەژین. هاوکات لەملاشەوە عەبدولسەلام و هاوڕێکانی لە گەرمەی ناکۆکییەکانی ناوەوەیان لەگەڵ سەرکردەکانی (قیادە قطریە و قەومییە) کە لە ڕۆژی ١٩٦٣/١١/١٣ دەستی پێکرد، هەلیان بۆ ڕەخسا لە ڕۆژی ١٩٦٣/١١/١٨دا دەسەلاتیان بەسەر ڕژێمدا گرت و کەوتنە هەڵوەشاندنەوەی (حەرەس قەومی)و ئەنجومەنی نیشتمانیی شۆڕش و ئەو دامودەزگا تایبەتییانەی کە بەعس دروستی کردبوون. بەمجۆرە عەبدولسەلام و هاوکارەکانی توانییان ڕژێمی کودەتاکەی بەعس لەناو ببەن و خۆیان دەسەڵات و لێپرسراوێتی سەربازی و دەزگاکانی دەوڵەت بگرنە دەست.

## بەشی هەشتەم
## کودەتاکەی ١٨ی تشرینی ١٩٦٣
## هاتنی عەبدولسەلام عارف و عەبدولڕەحمان عارف

بە هاتنی (عەبدولسەلام عارف)و هاوکارەکانی دەیانزانی بەبێ ڕێککەوتن لەگەڵ شۆڕشی کوردو بەبێ وەستاندنی شەڕی کوردستان، ناتوانن بەردەوام بن لە دەسەڵات و لێپرسراویێتی ڕژێمدا، بۆیە کەوتنە پەیوەندیکردن بە شۆڕش و سەرکردایەتییەکەیەوە. توانییان لەگەڵ شۆڕش بەیانێک دەربکەن بە واژووی (عەبدولسەلام عارف و مستەفا بارزانی) بۆ وەستاندنی شەڕو چالاکی سەربازی.

لەو بەیانەدا بە ڕوون و ئاشکرا مافەکانی کورد دیاری نەکرابوون، تەنها چەند خاڵێکی ئاسایی نەبێت، ئەویش وەکو لێبووردنی گشتی و بەردانی گیراوەکان و بژاردنی زیانەکان، بەتایبەتی زیانلێکەوتووەکانی قەزاکانی (دوکان و دەربەندیخان)و هەندێ شوێنی تر. ئەم بەیانە لە ڕۆژی ١٩٦٤/٥/٤دا دەرچووبوو، ڕژێمی عەبدولسەلام لە ڕۆژی ١٩٦٤/٦/٢ پرۆژەیەکی پێشکەش بە بارزانی کرد کە تێیدا بەمجۆرە مافی کوردی دیاریکردبوو: (هەموو عێراقییەک یەکسانن لە بەرامبەر یاساو ماف و پێویستی سەرشان و جیاوازی نییە لەنێوانیاندا لە ڕووی دین و ڕەگەزو ڕەسەنایەتییەوە، مافی کوردو عەرەب پارێزراوە لە چوارچێوەی عێراقدا، مافی کوردو جۆری ئەو مافە نەتەوەییە لە ئەنجومەنی نەتەوەدا ڕووندەکرێتەوە کاتێک کە ئەنجومەن هەڵبژێردرا. هەروەها ڕێگا دەدرێت بە قوتابیانی کورد تا قوناغی سێیەمی ناوەندی بە

کوردی بخوێنن، بەڵام ناوچە کوردییەکان بە عەرەبی، پێویستە فەرمانبەرو مووچەخۆران کوردبن، لە ناوچەکەدا قوتابی کورد لە زانکۆو ناردنیان بۆ دەرەوەی وڵات وەردەگیرێت بەگوێرەی ژمارەیان، هەروەها ناوچە کوردستانییەکان ئاوەدان دەکرێتەوە).

عەبدولسەلام و نوێنەرانی رژێم (تاهیر یەحیا وەزیری بەرگری، پارێزگاری سلێمانی، بارزانی، سەرکردەکانی پارتی، نوێنەرانی شۆڕش)یان بینی، ئەم ڕێککەوتنەی بارزانی و عەبدولسەلام ناکۆکییەکانی ناو پارتی و بارزانی گەورەتر کرد لە بارێکی نهێنییەوە.

بارزانی لە ڕۆژی ١١/١٠/١٩٦٤ ئەم داوایانەی وەک بیرخستنەوەیەک نارد بۆ عەبدولسەلام عارف و تاهیر یەحیای سەرۆک وەزیران. بارزانی لەو نووسراوەدا ڕوونیکردبووەوە کە نەتەوەی کورد وەکو عەرەب خاوەن زەوی و نیشتمانی خۆیەتی و بۆ پاراستنی درێغی نەکردووەو نایکات. تەنانەت ئەو ڕژێم و دەستانەی کە تائێستا هاتوونەتە سەر حوکم لە عێراقدا هەموویان درۆیان کردووە لە جێبەجێکردنی مافەکانی گەلی کوردا. بۆیە بە بیری هێنابوونەوە کە پێویستە لە ڕژێمی عێراقدا ئەنجومەنێکی نیشتمانی بەزووترین کات لە نیشتمانپەروەران هەڵبژێردرێت، کە بتوانن هەموو بڕیارو مافێکی کورد جێبەجێ بکەن و بڕیاری لەسەر بدەن. هەروەها باری مێژووی کوردو پەیوەندی بە عەرەبەوە لەکاتی دروستبوونی دەوڵەتی عێراقدا، کە چۆن بڕیاریدابوو بۆ مافی کورد پارێزراو بێت، ئەم خاڵانەی بۆ دیاریکردبوون:-

١- گۆڕینی بڕگەی ماددەی ١٩ لە دەستووری کاتیدا، کە بەمجۆرە بڕیار درابوو (لەم دەستوورەدا کە مافی نەتەوەی کورد حوکمی

زاتی) لە چوارچێوەی عێراقدا جێبەجێ بکرێت.

٢- بۆ جێبەجێکردنی ماددەی سەرەوە لە خاڵی یەکەمدا، پێویستە ئەمانە جێبەجێ بکرێن.

- پێکهێنانی یەکێتییەکی ئیداریی لەم ناوچانەدا (هەولێر، کەرکوک، سلێمانی، قەزاکانی وەکو زاخۆ، دهۆک، عقرە، عمادیە، شێخان، سنجار، تلعفر، خانەقین)، هەموو ئەو ناوچانەی کوردیان تیایە لە لیوای موسڵ و دیالە ناوبنرێن بە ناوی (ولایەت، یان پارێزگا).

- ئەم ناوچانەی بەهۆی (ئەنجومەنی یاسادانان و جێبەجێکردن) ەوە ئیدارە بکرێت، ئەم ئەنجومەنانە دانەری یاساو جێبەجێکردن بن لە کوردستاندا.

٣- ئەم کارانەی کە بەو ئەنجومەنانە دەسپێردرێن ئەمانەن:

- جێبەجێکردنی یاساو و پەیڕەو لەڕووی (داد، ئیدارە، پۆلیس، پەروەردە، تەندروستی، کشتوکاڵ، دارستان، ڕێگاوبان، شارەوانی، کۆمەڵایەتی، ئاوەدانکردنەوەو نیشتەجێکردن، گەشتیاری، توتن).

- دامەزراندنی کاربەدەست و فەمانبەر.

- زمانی کوردی زمانی فەرمی وڵات بێت لەپاڵ زمانی عەرەبیدا، ئاگاداری مافی کەمەنەتەوەکانی تر بن.

٤- مالیە (دارایی) ویلایەتی کوردستان لە بەرهەمە ناخۆییەکان وەک (باج و ڕسومات، بەشی ویلایەت لە نەوت و گومرگ و فرۆکەخانە، قەرز وەرگرتن).

٥- پاراستنی مافی کەمە نەتەوەکان لە ڕۆشنبیری و زانیاری کۆمەڵایەتی ئابووری و ئازادییە دیموکراتییەکان... هتد.

٦- جێگری سەرۆک کۆمار کورد بێت.

٧- دروستکردنی ئەنجومەنی وەزیران بۆ کوردستان و جێگری سەرۆک وەزیران کورد بێت.

٨- دروستکردنی زانکۆو پەیمانگاو ناردنی قوتابی کورد بە زەمالە بۆ دەرەوەی وڵات.

٩- کاروباری سەربازی:

١. مانەوەی پێشمەرگە بەناوی پاسەوانی سەر سنوور کە ژمارەیان (٢٠) هەزار بوون.

٢. سەربازی کورد لە ناوچە کوردستانییەکان بێت.

٣. گەڕانەوەی ئەفسەرو جێگری ئەفسەرو دەرکراوەکانی سوپا بۆ شوێن و جێگای خۆیان و ماوەی دەرکردنیان بەخزمەت هەژمار بکرێت.

٤. وەرگرتنی قوتابی کورد لە (کۆلێجی سەربازی، پۆلیس، فڕوکەوانی و ئەرکانی سوپا بەگوێرەی ژمارەی کورد).

٥. بڕیاردانی دادگای عورفی بە ڕەزامەندی ئەنجومەنی کوردستان بێت.

٦. لابردنی هەر ناوەڕۆکێکی یاسایی کە لەگەڵ ئەم مافانەدا بگونجێت، سەرچاوەکەی لە هەرکوێ بێت.

٧. بۆ ڕاپەراندن و جێبەجێکردنی ئەم خاڵانەی سەرەوە، لیژنەیەک پێک بێت لە هەردوولا وەکو یەک (شۆڕش و ڕژێم) بۆ باسکردن و لێکۆڵینەوەو پڕۆژە ئامادەکردن و پەیڕەو کە ڕژێم دەری بکات.

ئەمانە چەند خاڵێکی وەکو گەڕانەوەی فەرمانبەرو ئازادکردنی بەندکراوەکان و دوورخراوەکان و بژاردنی زەرەرو زیانلێکەوتووەکان.

هەڵوەشاندنەوەی جاش و گۆڕینی ماددەی یەکەم لە دەستوور بەمجۆرە (نەتەوەی عەرەب لە عێراقدا بەشێکە لە عەرەب)، لە هەرکاتێکدا عێراق لەگەڵ هەر وڵاتێکی گەلی عەرەبیدا یەکیگرت، کوردستان دەبێتە هەرێمێکی جیا. هەر مافێک ئەو وڵاتانە هەیانبێت، دەبێت هەرێمی کوردستانیش ئەو مافەی هەبێت.

هەر لەدوای وەزیری ناوخۆ (سوبحی عەبدولحەمید) نووسراوێکی نارد بۆ بارزانی بە ڕێککەوتی ١٩٦٤/١٢/٢٥ تێیدا نووسیبووی، ئەو داوایانەی کاتی خۆی بەخشیویانە بە کورد، مافی کوردە، لەوە زیاتر پێداگرتن زەرەر بە کورد دە گەیەنێت. بابەتی خوێنڕشتنی خستبووە ئەستۆی شۆڕشی کورد. تەنانەت خوێندن بە کوردی و چەند (فشەمافێکیان) بە کورد ڕەوا نەدەبینی. ئەمانەش نەتەوەییە عەرەبەکانی سەر بە عەبدولناسر بوون کە پڕوپاگەندەی مرۆڤایەتی و دادپەروەرییان دەکرد. دوابەدوای ڕێککەوتی ١٩٦٤/٢/٢٧ نامەیەکیان بۆ بارزانی نارد هەر هەمان وەزیر کە (نایانەوێت تەعریبی) ناوچە کوردییەکان بکەن و ڕێگە دەدەن لە قەزاو ناحییەکان بە کوردی بخوێنن، داوایان کردبوو پێشمەرگە (هەڵوەشێنن)و بگەڕێنەوە بۆ لای ڕژێم، ئەوەی دووپات کردبووەوە هەر ڕووداوێک ڕوویدا دژی ڕژێم، شۆڕشی بارزانی تاوانبارە.

هەروەها جارێکی تریش وەزارەتی ناخۆی بە ئیمزای وەزیری ناخۆ بەهۆی پارێزگاری سلێمانییەوە (عەگید سدیق) کە نوێنەری بارزانی بوو، ئاگادارکرا بە نووسراوی ژمارە (٩٥٥٠) مدروس لە ڕۆژی ١٩٦٥/٢/١١ بە دانانی وەزارەتێک بەناوی وەزارەتی ئێشوکاری سەروو. هیچ لیوایەکی تازەش دروست ناکەن، یان

قەزایەک کە ببەستنەوە بە لیوایەکی ترەوە. ناتوانین بڕیاری مانەوەی پێشمەرگە بدەین بە هیچ جۆرێک. ئیمزاکە (صبحی عبدالحمید) کردبووی.

لە بەرامبەریشدا بارزانی بە نووسراوێک لە ڕۆژی ١٩٦٥/٢/١٨ ئاگاداری کردنەوە، کە ئەوانەی داوایان کردووەو مافێکی ڕەوای و دادپەروەرانەی خەڵکی کوردە، کەمترین مافە بۆ نەتەوەکەمان کە پێی ڕازیبێت، لەبەرئەوە هیوامان وایە کە چاو بگێڕنەوە بە هەڵوێستی خۆتاندا بۆ جێبەجێکردنی داواکانی شۆڕشی کورد لەپێناوی بەهێزکردنی یەکێتیی نیشتمانیدا.

هەروەها نوێنەری بارزانی لە سەرەتای مانگی مارتی ساڵی ١٩٦٥ لەگەڵ (تاهیر یەحیا) دیدەنییان کرد، پاش وتوویژ (تاهیر یەحیا) نامەیەکی بۆ بارزانی نووسیبوو، تێیدا داوای لە بارزانی کردبوو بۆ ڕێککەوتن و شەڕ نەکردنەوەو چارەسەری بابەتەکە بە ئاشتییانە. بارزانیش لە ڕێککەوتی ١٩٦٥/٣/١٢ بە (شەفیق ئاغاو سەرداری حەمەئاغا)دا وەڵامەکەی بۆ ناردبووەوە، تێیدا ڕوونیکردبووەوە کە کوردیش هەرگیز نایەوێت بە خوێنڕشتن چارەسەری بابەتەکە بکرێت، کورد لەگەڵ چارەسەری ئاشتییانەدایە، بە ڕێگایەکی ئاسایی حەز بە وەرگرتنی مافەکانی دەکات. مافەکانیش هەر ئەو داوایانە بوون کە لەوەوپێش داواکرابوون، بەڵام ئەمجارەیان بەشێوەیەکی کورت و ئاسانتر کەمکردنەوەی ناوەڕۆکەکەیەتی.

ڕاستییەک هەیە پێویستە هەموو کورد ئاگادار بێت کە لەناو لێپرسراوانی سەربازی و سیاسی ڕژێمی (عەبدولسەلام)دا زۆر داخ لەدڵ و دوژمن بە کوردو کوردستان هەبوون، لەوانە (عەزیز

عقیلی)و هاوکارەکانی، ئەمانە بڕوایان وابوو کە دەبێت کورد لەناو ببرێت، بەهیچ جۆرێک وەڵامی نەدرێتەوە. کوردە هاوکارو دەست و پێوەندەکانی ڕژێم لەپێش پێشمەرگەو شۆڕشگێڕانی کوردا لەناو ببرێن. سەرەڕای ئەوەی دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات و ئەفسەرە گیرفانپڕەکان و دەوڵەمەندەکانی شەڕی کوردستان لە کۆبوونەوەیەکی کۆشکی کۆماریدا بە مێژووی ١٩٦٦/١٠/٢١ بە ئامادەبوونی (عەزیز عقیلی) بەئاشکراو بێ پێچوپەنا دەنگی نامەردانەیان هەڵبڕی، لە بەرامبەر بەهەموو مافێکی کوردو دەبێت سەری کورد پان بکەنەوە. تەنانەت کوردە خائین و جاشەکانیش لەپێش نیشتمانپەروەر نەتەوەییەکاندا. بەناوی نەتەوەیی نیشتمانپەروەری عەرەبەکانەوە (مەحمود دورەو مدیری ئیستخباراتی گشتی) هێرشێکی نارەواو ڕەگەزپەرستانەیان کردە سەر شۆڕشی کوردو بارزانی. ئەمە نەتەوەییە پێشکەوتووخوازەکان و سەر بە عەبدولناسر بوون.

تەنانەت ڕۆژنامەی (ئەهرام) لەسەر زمانی مامۆستای ئەم نەتەوەییانە (عەبدولناسر) لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٦١/٩/٧دا نووسیبووی (کۆماری عەرەبی یەککرتوو دژی جیابوونەوەی کوردەکانە لە نیشتمانی عەرەب، عەبدولکەریم قاسم لێپرسراوە بەرامبەر بەهێزکردنی گیانی جیابوونەوەی کورد، ئەو هەواڵانە وا دەگەیەنن کە کورد یەکێتیی نیشتمانیی عێراق تێکدەدەن).

هەروەها پاش کەوتنی ڕژێم عەبدولکەریم قاسم (جەمال عەبدولناسر) لە کۆبووەنەوەیەکیان لەگەڵ (عەلی ساڵح سەعدی و مەهدی عەماش) لە ٢٣ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا لە ماڵی عەبدولناسر

کە (ساڵح سەعدی و مەهدی عەماش) پێی ڕاگەیاندبوون، بەعس لەگەڵ کوردەکان وتووێژیان کردووە، کورد داوای (استغلالی ذاتی) دەکەن و ئێمەش ئاگادارمان کردوون کە بە تێپەڕبوونی کات لە دوا ڕۆژدا بۆیان جێبەجێ دەکەین. کوردەکان داوای متمانەو بەڵگە دەکەن بۆ ڕاستی قسەکەمان، ئێمەش ئاگادارمان کردوون کە لەپاش ئەوەی لەگەڵ عەرەبی یەککگرتوو یەکمانگرت (کیانێکی خۆیی)تان دەدەینێ. عەبدولناسر لە وەڵامی عەماشدا وتبووی: بڕیاری حکومی زاتی خەتەرە، لەوانەیە سوریاش بۆ ئەوە ڕاکێشێت، ئەوەش بزانن کە (ئینگلیزو ئێران) هەموو کات دژی عێراقن، لەبەرئەوە جۆرە حوکمێکی ناوخۆیی وایان بدەنێ کە دووربێت لە حکومی زاتی.

پاش ئەم کۆبوونەوە سێ قۆڵییە، عەبدولناسرو عماش و سەعدی (جەلال تاڵەبانی) کە لەگەڵ شاندی عێراق دەبێت لەگەڵ (فواد عارف) پاش ڕۆژێک لەدوای کۆبوونەوەی ئەو سیانە، عەبدولناسر (جەلال تاڵەبانی، فواد عارف) بانگ دەکات و کۆدەبێتەوە لەگەڵیان، ئەمانیش بە دووروودرێژی باسی مەسەلەی کوردو ماف و داواکانی کوردیان بۆ باسکردبوون. لە وەڵامدا عەبدولناسر وتبووی (ئێمە لەگەڵ چارەسەری کێشەی کوردین بەئاشتی و گفتوگۆو دوور لە جیابوونەوە، جۆرە حوکمێکی کە زەرەر نەدا لە یەکێتیی عێراق)، مەبەستەکەی جەمال عەبدولناسر ئاوای دەگەیاند، کە وەکو جۆری بەشکردنی ناوچە ئیدارییەکانی میسر لە عێراقیشدا ئەمجۆرە (لامەرکەزییەک) ئیدارییە بۆ هەموو ناوچەکانی عێراق دروست بکرێت، تانانەت دابووی بە گوێیاندا کە زۆر نەکەن لە

ڕژێمی عێراق، تەقدیری ئەوە بکەن کە خەریکی گفتوگۆی یەکێتیی عەرەبن. ئەگەر بێت و هەوڵی شەڕکردن بدەنەوە، هەموو عەرەب بەرەنگاریان دەبێت. سەیری لێکدانەوەی ئەم ئازادیخوازو نەتەوەییە پێشکەوتووخوازانەی عەرەب بکەن. ئەوەیان لا باش و پەسەندە گفتوگۆو یەکبوونی عەرەب گیروگرفتی نەیەتە ڕێگا، بەڵام ئەو تەنگوچەڵەمە گەورەیەی نەتەوەیەک کە لەژێر دەستیاندایە هۆیەکی گەورەیە بۆ کەوتنی ڕژێمەکان، نابێت باسی بکرێت و چارەسەرێکی مرۆڤانەو دادپەروەرانەی بۆ دابنرێت!

پاش دروستبوونی وەزارەتی (بەزاز)و بڵاوکردنەوەی بەرنامەی وەزارەتەکەی لە ١٩٦٥/١٠/٦ دیاریکردبوو، کە هەوڵی گەڕانەوەی ئاشتی و ئاسایش دەدا مافی کورد لە دەستووردا پارێزەری دەبێت بە دامەزراندنی یاسای (ئیدارە ناوخۆییەکان) لە هەموو عێراقدا. لە ڕۆژی ١٩٦٦/٦/٩ لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا، ئاشکرای کرد کە هەندێک لە برا کوردەکان لەسەرووی وڵات، واتا (الشیمال العراق) (مەبەستی کۆمەڵی ئیبراهیم ئەحمەدو جەلال تاڵەبانی) بوو، کە لە ئێران گەڕابوونەوە، هاتوون بەرەوپیری داواکەمان و دەیانەوێت شەڕو کوشتار نەمێنێت و بەئاشتییانەو کردەوەی سیاسی چارەسەری مەسەلەی کورد بکرێت. هەروەها وتی: ئێمە بڕوامان بە کەلەپوورو زمان و پێویستییە نەتەوەییەکانی کوردە لە ئیدارەیەکی لامەرکەزیدا، هەروەها ئێمە بڕوا دەهێنین بە مافی کورد. شەڕو کوشتاریش کۆتایی نایەت ئەگەر (١٠٠٠)یان (٥٠٠) یان (٥٠) کورد ڕازی نەبن دەتوانن ناوچەکە بشێوێنن و ئاسایش تێکبدەن.

له رۆژی ١٩٦٦/٦/٢٩ لەڕادیۆو تەلەفزیۆنی بەغداوه (عەبدولڕەحمان بەزاز) ئەو ڕێککەوتنەی بڵاوکردەوه کە لە (١٢) مادده پێکهاتبوو لەنێوان (بارزانی و عەبدولڕەحمان عارف)دا ئیمزاکرابوو، ماددەکانیش ئەمانە بوون:-

١- داننان بە نەتەوەی کورددا لە دەستووری هەمیشەیی لە عێراقدا، کە کورد نەتەوەیەکی سەرەکییە لەگەڵ عەرەب لە عێراقدا، هەروەها بڕواهێنان بە یاسای پارێزگاکان.

٢- بڕواهێنان بە زمانی کوردی.

٣- بڕواهێنان بە نوێنەرایەتی کوردەکان لە ئەنجومەنی نیشتمانیدا بەگوێرەی ژمارەیان.

٤- دیاریکردنی ژمارەی قوتابیانی کورد لە هەموو بەشەکانی خوێندن لەسەر مووچەی ڕژێم.

٥- ڕێگەدان بەڕێکخستنی سیاسییەکان و ڕۆژنامە بە کوردی و عەرەبی.

٦- دەرکردنی یاسای لێبووردنی گشتی بۆ گەڕانەوەی بەندکراو و دەرکراوەکان بۆ کارو فەرمان و شوێنەکانی خۆیان.

٧- پێدانەوەی چەکەکانی پێشمەرگە بە ڕژێم.

٨- گەڕانەوەی پۆلیس و سەرباز بۆ شوێنەکانی خۆیان.

٩- گەڕانەوەی حاکمە کوردەکان بۆ جێگاو شوێن و فەرمانی پێشوویان.

١٠- دامەزراندنی (هەیئەتێک) بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچەی کوردییەکان.

١١- بژاردنی زەرەرو زیانەکان.

١٢- رژێم لێپرسراوی ئەمن و ئاسایشی دەرەوەو ناوەوەیە.

پاش ئەم ڕێکەوتنە چەند جارێک عەبدولڕەحمان عارف و بارزانی پێکەوە دانیشتن لە ناوچەکانی ڕەواندزو جێگای دیکەی کوردستان، هەروەها وەزیری بەرگریی عێراق (شاکر مەحمود شکری) لە سەرەتای نیسانی ١٩٦٦ بەدواوە دەهاتە لای بارزانی.

## بەشی نۆیەم
## بەعس و ڕێکەوتنەکەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠و شەڕکردنەوەی ١٩٧٤

لەبەرئەوەی بەعس لە کەوتنەکەی ١٨ی تشرینی ساڵی ١٩٦٣دا لێدانێکی کاریگەریان بەرنەکەوت، تەنانەت پاش ماوەیەکی زۆرکەمیش (ئەحمەد حەسەن بەکرو ئەفسەرە بەعسییەکان) لە گرتووخانەکان ئازادکران و پەیمانیان لێوەرگرتن بە نووسین، کە جارێکی تر سیاسەت نەکەن و تێکەڵی هیچ حزبێک نەبن. ئەوە بوو ئەحمەد حەسەن بەکرو هاوکارەکانی بەئاشکرا لە ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەدا بڵاویانکردەوە، کە لەمەودوا خەریکی کاروباری کشتوکاڵی و مەڕوماڵات و مریشک بەخێوکردن دەبن و دوورەپەرێز دەبن لە کاری سیاسی.

پاش ئەوەی عەبدولسەلام لەگەڵ چەند وەزیرێکی ڕژێمەکەی بە کارەساتی فڕۆکە کەوتنەخوارەوە لەناوچوون، عەبدولڕەحمان عارف کە پیاوێکی بێدەنگ و جموجۆڵی کەم بوو، لە جێگای براکەی عەبدولسەلام دەستنیشان کرا. هەرچەند کەسانی تر هەبوون لە ئەفسەرەکان خۆیان ئامادە کردبوو بۆ جێگاکەی عەبدولسەلام، وەکو (عەزیز عقیلی) پاش هاتنی عەبدولڕەحان عارف دەزگاکانی میری کەوتبوونە بارودۆخێکی تایبەتییەوە، دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات دژی عەبدولڕەحمان بەزاز دەجووڵانەوەو دەیانویست لە سەرۆک وەزیری لایبەرن. بۆیە کەوتنە کۆکردنەوەی ئەو ئەفسەرانەی تەماعی بەدەستهێنانی دەسەڵاتیان هەیەو ئەو

ئەفسەرانەی ئارەزووی خۆدەوڵەمەندکردنیان هەیە لەسەر حسابی ڕژێم. لەم بێدەسەلاتی و بێدەنگییەی عەبدولڕەحمان عارف. ئەحمەد حەسەن بەکرو ئەو ئەفسەرانەی دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات کەوتنە جموجۆڵ لەناو دەزگا سەربازییەکاندا. پێدانی بەڵێن و پەیمان بەو ئەفسەرانەی کە هاوکارییان بکات بە سەرکەوتنیان پلەو پایەیان دەدرێتی، ئەوە بوو لە بێئاگایی عارف و بێدەسەلاتی و بێدەنگی ئەو، سوودیان وەرگرت و کودەتاکەیان لە ١٧ی تەمموزی ساڵی ١٩٦٨دا سەری گرت. ئەم چەند بەعسییە کە مابوونەوە پێش ١٧ی تەمموز هەلیان بۆ ڕەخسابوو کە بەئاشکرا کۆبوونەوە بکەن لەژێر چاودێری ئیستخباراتدا، ئەوە بوو (ئەحمەد حەسەن بەکر) بۆ سڕینەوەی ڕابردووە ڕەشەکەیان، لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣دا لە ساحەی تەحریر وتارێکی داو تێیدا کەوتە پروپاگەندە، کە ئەمانە پێ بە هەڵەکانی پێشوویاندا دەنێن و مافەکانی کورد بە مافێکی ڕەوا دەزانن و کۆمەڵێ قسەی لەمجۆرە.

پاش سەرکەوتنی کودەتاکەیان لە ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨دا لە سەرەتادا نەیاندەوێرا خۆیان ئاشکرا بکەن، چونکە هەست دەکرا کە کودەتاکە بەعسی نەبوون. لەلایەکی ترەوە ئەمانە خەریکی فڕوفێڵ بوون لەو ئەفسەرانە. هەروەها لەبەر پاشەڵ پیسییان ئەوە بوو کەوتنە پیلانگێڕان دژی (نایف و عەبدولڕەحمان داودو چەند ئەفسەرێکی تری) بەدەسەلات، لە ٣٠ی تەمموزدا هێنانی کەسانی ترو لەبەرکردنیان بە بەرگی ئەفسەری بە جۆرەها ڕوتبەی سەربازی و ناونیشانەوە. تەنانەت ئەمانە زۆربەشیان نەخوێندەوارو (سەرسەری) سەر شەقامەکان بوون، دامودەزگای

سەربازی و ئەمن و ئیستخباراتی لێ دروستکردن، سەرەڕای دروستکردنی چەند ئەندام و دەزگایەکی تایبەتی خۆیان، پاشان بەرامبەر مەسەلەی کورد کەوتنە نەخشەو پیلانگێڕان. لە سەرەتادا کەوتنە هێرش هێنان بۆ سەر کوردستان بۆ دوورخستنەوەی ئەو سەربازو ئەفسەرو لیواو فەوجانەی لێیان دڵنیا بوون. بەهاوکاری جاش و (جەلالییەکان)، پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە ناتوانن بەسەر شۆڕش و کوردا سەرکەون و ڕۆژبەڕۆژ لە بەرەکانی شەڕدا تێکدەشکێن و خەزینەی ڕژێم بەرەو بەتاڵبوونەوە دەچێت، لەلایەکی ترەوە ترس لە بەردەوامیی شەڕ کە دەبێتە هۆی ڕووخاندنیان بەمەبەستی پاککردنەوەی دامودەزگاکانی ڕژێم لە دووژمنەکان، یان پاککردنەوەی ئەو پارت و کۆڕو کۆمەڵانەی کە هەبوون، کەوتنە خۆ نزیککردنەوە لە شۆڕش و بارزانی بە زنجیرە نووسینێک لەژێر ناونیشانی (كيف السبيل الى حل المسألة الكردية) لە ڕۆژنامەی (الثورة) لێپرسراوانی بەعس مەسەلەکەیان جوڵاند. چەند کوردێکی ڕۆشنبیر سەر بە شۆڕش و بارزانی بە ئاگاداری شۆڕش وەڵامی ئەو نووسینانەیان هەر لە ڕۆژنامەی (الثورة) دایەوە، ڕێگا خۆش کرا بۆ نزیکبوونەوەی گفتوگۆی نێوان بەعس و شۆڕش.

لەمانە (عەبدولسەمەد خانقا) چەند نووسینێکی بڵاوکردەوە...

پاشان بەعس کەوتە پەیوەندیکردن بە شۆڕش و بارزانی تەنانەت چەند کەسانێکی ناسراوی وەکو (عەزیز شەریف) لە هاتوچۆو نزیکبوونەوەی هەردوولادا بەشدارییان کرد. ئەوەبوو گەیشتنە ڕێککەوتنی بەیانی (١١ی ئازاری ١٩٧٠)، بە دەرکردنی ئەم بەیانە، نەتەوەی کورد زیاتر بڕوای بە بارزانی پتەو و بەهێزتر

بوو. هەموو کۆڕو کۆمەڵە سیاسییەکان پشتگیری خۆیان بۆ ئەو ڕێککەوتنە نیشاندا، تەنانەت دەوڵەتە گەورەکان پاڵپشتی خۆیان بۆ ئەو ڕێکەوتنە نیشاندا. دەوڵەتی شورەویی لایەنگری خۆیان دەربڕی بۆ ڕێککەوتنەکە.

**ناوەڕۆکی ڕێکەوتنەکە، خاڵەگرنگەکانی بریتیبوون لەمانە:**

١. بڕواهێنان بە بوونی کورد لە دەستووری کاتی و هەمیشەییدا، کە ڕاستییەکی مێژووییە.

٢. دامەزراندنی زانکۆی سلێمانی و کۆڕی زانیاری کوردو بڕیاری هەموو مافێکی ڕۆشنبیری و زانیاری زمانی کوردی لە هەموو پلەکانی خوێندندا، لە قوتابخانەکان تا دەگاتە پەیمانگاو زانکۆو خانەی مامۆستایان و زانکۆی سەربازی و پۆلیس. ڕێگەدان بەو پەڕاو و نووسین و نووسراوە سیاسی و ئەدەبی و زانیارییانەی خزمەتی بەرژەوەندی نیشتمانی و نەتەوەیی کورد دەکەن. دروستکردنی یەکێتیی ئەدیبان و دەزگای تایبەتی بۆ چاپکردن بە کوردی. هەروەها دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی و ڕۆشنبیریی کوردی و دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤارو بە کوردی، زیادکردنی بەرنامەی کوردی لە تەلەفزیۆن و ئێستگەی کوردی.

٣. هەروەها بڕواهێنان بە مافی کورد لە زیندووکردنەوەی کەلەپووری و جەژنە نەتەوەییەکانی وەکو نەورۆز. دەرکردنی لێخۆشبوونی گشتی و دامەزراندنی کوردەکان لە هەموو پلەوپایە گرنگەکانی سەربازی و دەزگاکانی ڕژێمدا. گەڕانەوەی قوتابییە دەرکراوەکان بۆ خوێندنەکانیان و کردنەوەی قوتابخانەو زانکۆو کۆلێژی سەربازی و ناردنی قوتابیانی کوردەکان بە زەماله بۆ

خوێندن لە دەرەوەی وڵات، فەرمانبەر لە ناوچەی کوردستان دەبێت کورد بێت.

دامەزراندنی پارێزگاو قائیمقام و بەڕێوەبەری ناحیەو بەڕێوەبەری پۆلیس و ئەمن لە کورد، دامەزراندنی ڕێکخراوە کوردستانییەکان، وەکو: (قوتابیان، لاوان، ئافرەتان، مامۆستایان). گەڕانەوەی فەرمانبەرو کرێکارو پۆلیس و سەرباز بۆ جێگاو شوێنەکانی خۆیان بۆ کارکردن بەمەبەستی ئاوەدانکردنەوەی کوردستان، هەروەها بڕینەوەی مووچە بۆ خێزانی شەهیدان بژاردنی زەرەرو زیان، گەڕانەوەی ئەو عەرەبانەی هێنرابوونە جێگای کوردە دەرکراوەکان. جێبەجێکردنی یاسای چارەسەری کشتوکاڵ، گۆڕینی دەستووری کاتی، بەمجۆرە گەلی عێراق پێکهاتووە لە دوو نەتەوەی سەرەکی عەرەب و کورد، ئەم دەستوورە مافی نەتەوەی کوردو کەمەنەتەوەکان دەپارێزێت لە چوارچێوەی یەکێتیی عێراقدا. هەروەها زمانی کوردی فەرمییە لەپاڵ زمانی عەرەبیدا، پێدانەوەی ئێستگەو چەکە قورسەکانی پێشمەرگە بە ڕژێم و جێبەجێکردنی کۆتا پلەی ڕێککەوتنەکە.

هەروەها جێگری سەرۆک کۆمار کورد بێت و گۆڕینی یاسای پارێزگاکان کە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەم ڕێککەوتنەدا بگونجێت، پێشمەرگە بکرێت بە (حرس حدود)، هەروەها یەکخستنی زۆر ناوچەو پارێزگا کە زۆربەی کوردن و هاوکاری کورد لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن و یاسادانانادا (تەنفیذی، تەشریعی) بەگوێرەی ژمارەیان بڕیاردانی (حوکمی ذاتی) لە ڕۆژی دەرکردنی (بەیانی ئازار)ەوە پاش چوار ساڵ. هەروەها بۆ جێبەجێکردنی ئەم ناوەڕۆکی

بەیانە لیژنەیەکی باڵا دروستکرا بۆ سەرپەرشتی جیبەجیکردنی، ئەوەی ڕاستی بیت کورد دڵخۆش بوو، چونکە بەئاشکراو بەڕوونی داگیرکەر دانی نا بەڕاستییەکانی مافی کورددا. لەلایەکی ترەوە بەرگریی ئابووری (گەمارۆی ئابووری) هەڵگیرا، کارو کاسبی و ئاودانکردنەوەو باری کشتوکاڵ زیندوبوونەوەو بەرەوپیشەوە چوون. قوتابخانەکان کرانەوەو نەخۆشخانەو چەند دامودەزگایەکی خزمەتگوزاری دروستبوونەوە. کاربەدەست و فەرمانبەرەکان گەڕانەوە سەر کارو پیشەی خۆیان، زیندانەکان ئازادکران، زۆر کاری تری بەسود ئەنجامدرا، بەڵام ئەوەی جیگای داخ بوو بۆ کورد، لیپرسراوانی پارتی و کادیرو بەدەسەڵاتەکانی ناو شۆڕش لە ئاستی لیپرسراویتی ئەو بارودۆخە تازەیەدا نەبوون، تەنیا کاریان ببووە پلەو پایە وەرگرتن و ئۆتۆمبیل و خانوو و دەستکەوتی تایبەتی. تەنانەت لەوکاتەدا شاعیری مەزن (هەژار) لە گۆڤاری (هەولیر)دا شیعریکی بەسەردا هەڵدان لەژیر ناونیشانی (حەلەق مەلەق) کە بەڕاستی پڕ بە پیستیان بوو.

لەڕاستیدا ئەمە جۆرە سیاسەتیکی بەعس بوو بۆ پووکانەوەی ڕیزەکانی شۆڕش و پارتی و پیشمەرگەو دروستکردنی دەستوپیوەند بوو، هەر پاش مانگیک دوای بەیانی ١١ی ئازار گۆڤاری (الصیاد) ی لوبنانی چاوپیکەوتنیکی بڵاوکردەوە لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئەوکاتە (مرتضى عبدالباقي الحديثي)، کە یەکیک بوو لە سەرکردە بەدەسەڵاتەکانی بەعس و ڕۆڵی گرنگی هەبوو لە بەیانی ١١ی ئازار، ڕیگە بۆ بەعس فراوان دەکات کە ڕیزەکانی دەزگاکانی ڕژیم و دەزگا سەربازییەکان پاک بکاتەوە لە دووژمنانی بەعس.

هەروەها کەمکردنەوەی دەسەڵاتی کوردو بارزانی و شۆڕشەکەیان و دامرکاندنەوەی ئەو گەرموگوڕییەی پێشمەرگە. ئەم گۆڤارە (الصیاد)، خۆم دوو دانەم دا بە مەکتەبی سیاسی لە چۆمان لە مانگی نیسانی ١٩٧٠، بەڵام لەوە دەچوو کە گرنگییان پێ نەدابێت هەر نەیانخوێندبێتەوە.

لەلایەکی ترەوە بەتوانایی و ژیریی و لێهاتن و چالاکی لێپرسراوانی پارتی و شۆڕش و (لق و ناوچەکان) لەوەدا نەبوو کە بتوانن بەرەنگاری ئەو پیلان و نەخشەو کارو کردەوانەی بەعس ببنەوە. ئەم لێپرسراوانەی شۆڕش و پارتی نەشارەزاو بوودەڵەو کەسانی نەخوێندەوارو بێ وەزن بوون، لەبەرئەوە بەکەمترین دەستکەوتی تایبەتی هەڵدەخەڵتێنران، سەرەڕای هەوڵ و کۆششی ئەم لێپرسراوانە بۆ دوورخستنەوەی دڵسۆزو کەسانی کوردپەروەرو لێهاتوو لە لیژنەی سەرکردایەتی و دەسەڵاتەکانی پێشمەرگەو پارتی و شۆڕشدا.

لەمجۆرە زەلکاوەدا بەعس کەوتبووە کڕینی دەست و پێوەندو دروستکردنی کەسانی لێپرسراوانی ناوەوەی شۆڕش بۆ مەبەست و مەرامی خۆیان، کە تێکدانی ڕیزی کوردەو دوورخستنەوەی کوردپەروەران و سوودوەرگرتن لە کاری نهێنی و ئاشکرای ناو شۆڕش. ڕووداوەکانی ساڵەکانی ١٩٧٠-١٩٧٤ باشترین شاهیدی وشەکانمانە، دەستتێوەردانی بەعس لە ڕیزەکانی پارتی و شۆڕش وایکردبوو کە دڵسۆزان و خاوەن تواناو بیروباوەڕی کوردایەتی دژایەتی بکەن و دوور بخرێنەوە، تەنانەت لەلایەن دەزگاکانی ڕژێم بەیارمەتی لێپرسراوانی پارتی چاودێریی دەکران. ئەم کارانەی

ئەڵقە لەگوێکانی بەعس و دەزگاکانی بەعس دەخرانە پێش چاوی (بارەگای بارزانی)و (مەکتەبی سیاسی)و (دەزگای پاراستن)، بەڵام بەداخەوە لەبەر گیرفان پڕکردن و دابەشکردنی پلەوپایەو مەحسوبییەت و گوێ نەگرتن لە هەق (ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە) هەموو ڕاستییەک دەشاردرایەوە.

هاوکات بەعس بەشێوەیەکی چالاک لە هەڵوێست و کارەکانیدا نەخشەو پیلانی بۆ گیانی (بارزانی) هەبوو، وەکو پیلانەکەی ئەیلوول ١٩٧١، هەروەها نەخشەکێشانی زنجیرە پیلانێکی دیکە بۆ لەناوبردنی دڵسۆزانی شۆڕش و بارزانی لە ئامرهێز و بەتالیۆنەکان و لێپرسراوانی تری شۆڕش، تەنانەت بۆ کوڕەکانی بارزانی، بەتایبەتی (ئیدریس و مەسعود). هەروەها بەئاشکرا هێرشیان بۆ سەر بارەگاکانی ناوچەی موسڵ و هاندانی دوژمنان بۆ تەقەکردن لە (ئیدریس بارزانی)و لێپرسراوانی شۆڕش لە شاری بەغدا، بەئاشکرا کڕینی سەرکردەکانی پارتی وەکو (عەزیز عقراوی، هاشم عقراوی)، هەروەها دروستکردنی کۆڕو کۆمەڵ لە جاسوس و دوژمنانی کورد بە ناوی (پارتی شۆڕشگێڕ). پارتی کە دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات و موخابەراتی بەشێوەیەکی ئاشکراو فراوان یارمەتی دەدان و نەخشەو پیلانی بۆ دەکێشان، هاوکات لە گرتن و ڕفاندنی کوردە نەتەوەییەکان و ونکردنیان و دەرکردنی کوردە فەیلییەکان بەردەوام بوو.

لەملاشەوە هەڵخەڵەتاندنی شیوعییەکان بۆ دژایەتی شۆڕشی کوردو بارزانی بۆ هاندان و تاقیکردنەوەیان، کە بزانن ئەم شیوعیانە چییان بۆ دەکرێت، واتە توانایان چەندە؟ ئەوەبوو

پرۆژەی هاوکارییان لەگەڵ (یەکێتیی شورەوی) لە نیسانی ساڵی ١٩٧٢، هەر بەم بۆنەیەوە زیادکردنی نرخی نەوت و کڕینی چەکی تازە لە شورەوی بۆ ئامادەبوون بۆ شەڕکردنەوە لەگەڵ کورد. بەعس هەوڵ و تواناکانی تەرخانکردبوو بۆ دوورخستنەوەی کورد لە دەوری بارزانی و شۆڕش، بەعس وەکو ڕژێم ئەوەبوو لەڕووداوەکانی ناوچەی (شنگار)و شەڕکردنەوە لەگەڵ کوردو شۆڕشدا ئەوەیان بۆ ڕوونبووەوە کورد پشتیوانی بارزانییەو لەژێر فەرمان و بڕیاری بارزانیدان، تەنانەت ئەو وتە گرنگانەی بارزانی لە گوێی کورددا دەزرنگایەوە کە بە (مرتضی حدیثی) وت لە کەرکوک هەڵبژاردن بکرێت کوردی تێیدا سەرکەوێت، یان سەرنەکەوێت ئەو ڕاستییە کەم ناکاتەوە کە کەرکوک کوردستانییە. ئەوە دڵنیاییەکی گرنگ بوو بۆ کوردپەروەران، بەتایبەتی (نەتەوەییەکان) کە بارزانی نیشانەو ناوێکی گرنگ و نەمرە بە یەخەی کوردەوە، تیشکێکی بەتین و ڕووناکە بۆ مانەوەی کوردستان بە ڕووناکی. سووتاندنی داگیرکەرو شەڕکردنەوەی ساڵی ١٩٧٤ ئەو ڕاستییەیان بۆ بەعس دووپات کردەوە کە بارزانی سەرۆکێکی مێژووییەو خولقاوە بۆ خزمەتی کوردو کوردستان. ئەو خەڵکە زۆرەی کوردستان بە هێمایەک مووچەو ڕابواردن و جێگاو خواردنی خۆی جێهێشت و دوای بارزانی کەوت، ئەم کارە سەری بەعسییەکانی ئاوسان، سەریان سوڕمابوو. تەنانەت بەو جۆرە چاوەڕێی ئەو بارودۆخەیان نەدەکرد، چونکە شیوعییەکان گەلێک درۆیان بۆکردبوون.

بەعس بە ئاشکراو بێ پێچوپەنا بڕوای وایە کە خاکی عەرەب لە شاخەکانی پشتکۆ دەست پێدەکات، ئەو نەتەوانەی لەسەر خاکی

عەرەب دەژین وەکو کورد و تورک و بەربەر... ئەمانە قەطعی ڕەگی نەتەوەیی خۆیان کردووە لە بۆتەی عەرەبایەتیدا تواونەتەوە، ئەوا بە چاوی عەرەبێک سەیر دەکرێن، ئەگەر بەم شێوەیە نەبن، دەبێت لە نیشتمانی عەرەبی دەربکرێن و ڕیشەیان لە بنەوە هەڵبکێشرێت، چونکە خەتەرێکی گەورەن لەسەر کیانی عەرەبی. بەعس دەزگای سەربازی و ڕژێمی پاککردەوە لە دوژمنەکانی، بە لەناوبردن و کڕینی هەندێکیان و نزیککردنەوەی شیوعی لە خۆیان و تەفرەدانیان. هەروەها پەیوەندییان بە شورەوییەوە بەهێز کردو چەند پەیمانێکی بازرگانی و ئابووری و سەربازییان واژۆ کرد، ئەمانە وایکرد کە لوتیان بەرزبێت، بەعس وایان دەبینی کە ئەمجارە شەڕی کوردستان بە هێزی سەربازی دەبەنەوە. ئەم سەرلێشێواندنەیان وای لێکردن بکەونە هێرش بۆ سەر کوردستان و ناوچە ڕزگارکراوەکان، بەهەموو جۆرە چەکێکی تازەوە، تەنانەت بە چەکی کیمیایشەوە، سەرەڕای یارمەتی جاش و سوپای ناشەعبی و شیوعییەکان و جۆرەها دەست و پێوەندی، کە بەم هەموو هێرشانەو تواناو هێزەیانەوە سەرکەوتنێکی وایان بەدەست نەهێنا، کە تۆزێک هیوایان پێ پەیدا بکات. تەنها لە چەند ناوچەیەکی بچووک بەولاوە لە ڕەواندوزو ڕانیە پاش شەڕی ١١ مانگ بە هێرشی گەورەو چەکی قورس و نوێوە. بەعس بۆی دەرکەوت کە شەڕ لە بەرژەوەندی ئەو نییەو زەرەرێکی زۆری لێکەوتووە، چ لە گیان، چ لە خەزینەی ڕژێم. ئەمجارەیان پیلانەکەیان بریتی بوو لە سەرشۆڕکردن بۆ ئێران و ئەمریکا، ئەوەش بۆ تەواوکردنی هەڵمەتە داگیرکارییەکەیان بوو دژی کورد.

بە چاوی خۆیان دەیانبینی پێشمەرگەی قارەمان لە هەموو شارو شارۆچکەکانی کوردستاندا لەپەرێزدان بۆ پەلامارو دەستوەشاندن لە دوژمن. تەنانەت ئەو جاش و شیوعییانەی بەڵێنیان دابوو پارێزگاری لە بەعس بکەن، بەپێچەوانەوە بەعس پارێزگاری لەوان دەکرد. بەهۆی هێزی ئەمن و سەربازی ڕژێمەوە دژی لەناوبردنی پێشمەرگە بوون، کە بەعس هیچ پەشیمانبوونەوەیەکیان لا گرنگ نییەو ئامادەن هەموو ناڕاستییەک بۆ بەرژەوەندی و سودی مانەوەی خۆیان دەستەبەر بکەن. ئەمرۆ پیاوی شورەوییە سبەینێ ئەمریکی دوو سبەی بۆ لایەکی تر. ئەمجارە بەرەو ئەمریکاو شای ئێران و دەست و پێوەندەکانی چوون، بەتایبەتی لە سەرۆک عەرەبەکان، ئەوەبوو سەریان شۆڕکرد بۆ داواکانی شا بە پێدانی (شط العرب) و چەند ناوچەیەکی سنووری، هەروەها دوورخستنەوەی ئێران و کۆتاییهێنان بە شەڕی زەنار... هتد.

هاوکات پەیمان و بەڵێنی بە ئەمریکا دا کە گوێڕایەڵی بڕیارەکانی ئەمریکا بێت لە ناوچەکەداو هاوکاری هاوپەیمانەکانی ئەمریکا بکات بۆ مەبەستی سیاسەتی ئەمریکا و سەرکەوتن بەسەر شیوعییەکان و هەڵوەشاندنی ڕێکخستنەکانی شیوعی و دوورکەوتنەوە لە سیاسەتی شورەوی لە ناوچەکەدا. ئەوەبوو ڕێککەوتنی جەزائیر مۆرکرا لەنێوان (شا و سەدام)دا، ئەمجارە ئاڕاستەکە گۆڕا بەرەو ڕۆژئاوا. پاش ڕێکەوتنی جەزائیر کوردپەروەران و دڵسۆزانی شۆڕش هەوڵیاندا کە کۆتایی بە شۆڕشی ئەیلوول نەیەت و بەردەوام بێت. هەندێک سەرکردەی شۆڕش و پارتی بڕیاری شەڕی پارتیزانییان داو تەنانەت بارزانی ڕازیبوو. بۆ ئەم مەبەستە

چەند لێپرسراوێک سیاسی و سەربازی کەوتنە کۆکردنەوەی ئازووقەو دابەشکردنی بۆ ناوچە سەخت و دژوارەکان تا ڕۆژی ١٧ی ئازاری ١٩٧٥. ئاگادارکران کە بڕیاری شەڕ وەستان دراوە. لەلایەکی ترەوە هەندێک سەرکردەی پارتی بەجۆرەها بڕوبیانووی بێ سەروبەر خۆیان لەو کارو کردەوەیە دوور دەخستنەوە کە شەڕ دەست پێ بکاتەوە. هەروەها ئێرانیش کەوتە بردنەوەی چەکە قورسەکانی، هەندێک لە سەرکردە بوودەڵەو ترسنۆکەکانی شۆڕش و پارتی خۆیان دایە دەست داگیرکەرو دەچوونە سەر تەلەفزیۆن و دەکەوتنە سەرزەنشتکردنی بارزانی و شۆڕش و پێشمەرگە. هەندێکیان کەوتنە خۆشاردنەوەو دزینی ئەو پارەو پول و کەلوپەلانەی شۆڕش، سەرەڕای ئەوەی دەچوون بەگژ یەکداو هەریەکە تاوانی هەرەسی ئەو شۆڕشە گەورەیەیان دەخستە ئەستۆی ئەوی ترەوە. پێشمەرگە ئازاو قارەمانەکانیش سەرسام و سەرلێشێواو نەیاندەزانی بەرەو چ ڕێگایەک ڕێ بگرن؟ بە هەناسەساردی و سەرگەردانی و دۆشداماوییەوە بیریان لە گیانی شەهیدان دەکردەوە، هەروەها ئازارو ئەشکەنجەی چەند ساڵەی شۆڕشی ئەیلوول کە چۆن بەهەدەر چوو و بە پەیمانێکی داگیرکەران لەدەستچوو.

## بەشی دەیەم
## یارمەتییە دەرەکییەکانی
## شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١

کەس ناتوانێت ئەو ڕاستییە نەسەلمێنێت کە هەر یارمەتییەک لەلایەن هەر دامودەزگاو نەتەوەو دەوڵەت و ڕژێمێکەوە بدرێت بە هەر شۆڕش و جوڵاندنەوەیەک، بێشک لەبەر ڕۆشنایی سودو بەرژەوەندی ئەو دامودەزگاو نەتەوەو دەوڵەتەیە کە دەیانەوێت و بەهۆی ئەو یارمەتییەوە مەبەستی خۆیان بەدیبێنن، بەڵام چەند دامودەزگاو ڕێکخراوی مرۆڤانەی دیکە هەن هەندێک یارمەتی مرۆڤانە پێشکەش دەکەن، وەکو پێداویستی داودەرمان و کەلوپەل و ئازووقەو هەندێک پێویستی تری ژیان، ئەمانە بە مەبەستی خزمەتکردنی مرۆڤایەتین و پارێزگاریی لە مانەوەی ژیان دەکەن.

لەبەرئەوەی هەڵکەوتنی ناوچەی کوردستان و نەخشەکەی بەجۆرێکی جوگرافی وا دابەشکراوە کە هیچ سنوورێکی نەماوەتەوە بە ڕژێمێکی داگیرکەرەوە نەبێت، لەبەرئەوە دوورە لە بەستنی هەندێک پەیوەندی بە دەوڵەت و ڕژێم و نەتەوەی بێگانەوە کە سودو بەرژەوەندییان نەبێت لە مەسەلەی کورداو بەشێکی کوردستانیان پێوە نەبەسترابێت. لەبەرئەوە باری پێویستی مانەوەی کوردو پارێزگاری لە قەوارەی نەتەوەیی ناچاری کردووە لە زۆربەی شۆڕش و جوڵاندنەوە سیاسی و سەربازییەکانیان بۆ بەرگری لە هێرش و کارو کردەوەی فەوتێنەرانەی داگیرکەر پەنابەرێتە بەر یەکێک لەو سنوورانەی تری کوردستان، کە لەژێر دەسەڵاتی

داگیرکەرێکی دیکەدایە، ئەم داگیرکەرانەی کوردستان لەبەر سودو بەرژەوەندی و تەماعی فراوانکردنی دەسەڵاتیان و دەستگرتن بەسەر خێروبێریدا هەمیشە لە ناکۆکی و دوژمنایەتیدا بوون، لە زۆر بارودۆخدا ئەم ناکۆکییە بەئاشکرا بووە، لەهەندێ کاتی تریشدا بەنهێنی بووە. پەیوەندییەکانی شاو ڕژێمی عێراق ئەم ڕاستیانەمان بەئاشکرا بۆ دەسەلمێنن.

ئێمە لەبەرئەوەی نووسینەکەمان لەبارەی شۆڕشی ئەیلوولەوەیە، بۆیە تەنها باسی ئەو نەتەوەو ڕژێم و دەوڵەتانە دەکەین کە یارمەتیان داوە بە شۆڕش. لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول و دروستبوونی بە یارمەتی و هاوکاری و بەخشینەکانی نەتەوەی کورد لە کوردستانی خوارووودا سودی لە یارمەتییەکەوە وەردەگرت، بۆ ئیدارەی سیاسی و کاروباری سەربازی و پێویستییەکانی پێشمەرگە لە هەموو ناوچەکاندا، چی سۆران، چی بادینان. بەهۆی کۆمەک و هەرەوەزی تاکەکانی کورد بەگوێرەی توانا ئەو یارمەتییانەی کە پێیبوویان بۆ بەردەوامیی شۆڕش و بەرەوپێشەوەچوونی لە ناوچەو دێهاتەکانی کوردستاندا بەدڵفراوانییەوە خزمەتی پێشمەرگەو دامودەزگا سیاسی و ئیدارییەکانی شۆڕش دەکرا. بەوجۆرە ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر هێرشەکانی داگیرکەرو پەلاماری دوژمنانەی زیادی دەکردو گەورەتر دەبوو و ناوچەی فراوانی دەگرتەوە، لەبەرئەوە دیارە شۆڕشگێڕانیش زیاتر پێویستیان بە یارمەتی و کۆمەک هەیە. هەر لە پێویستییەکانی شەڕو چەک و فیشەک و تەقەمەنی و داوودەرمان و ئازووقەوە، کە هۆی پێویستی بەردەوامیی و بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەرن، تا پێویستی بەخێوکردن و ئیدارەکردنی ژیانی خێزانەکانی پێشمەرگەو

ئەو لێپرسراو و کاربەدەست و کارگەرانەی شۆڕش. سەرەڕای ژیانی ئەو خەڵکانەی کەوتبوونە ناوچە ڕزگارکراوەکان و بەهۆی بۆردمان و تۆپبارانی داگیرکەرەوە زەرەرمەند بوون لە ماڵ و سامان و دارایی و کشتوکاڵیان نائومێد بوون، کە سەرچاوەی گرنگ بوون بۆ یارمەتیدانی شۆڕش. ئەمانە پێویستیان بە ئاوڕلێدانەوەیە، سەرەڕای خێزانی شەهیدان، ئەو خەڵکە شۆڕشگێڕەی ڕاوەدوو دەنران لەلایەن داگیرکەرەوە، پەنایان دەهێنایە بەر شۆڕش و پێشمەرگە، لەبەر ئەمانەو مسۆگەرکردنی بەردەوامیی شۆڕش و سەرکەوتنی.

کارێکی زۆر سروشتییە کە لەپاڵ پشتبەستن بە نەتەوەی کوردو شاخە بەرزەکانی کوردستان، دۆست و سەرچاوەی یارمەتی نوێ دروستبکرێت، پاشان دەبێت دروستکردنی ئەو دۆست و سەرچاوانە لەبەر ڕۆشنایی نەخشەو پلانێکی سنوور دیارو مەبەست ئاشکراو نەدۆڕاندنی جڵەوی سیاسی و سەربازی شۆڕش و دەسەڵات و بڕیارو فەرمان هەر لەدەست شۆڕشگێڕاندا بێت. لەبەر تیشکی ئەو ستراتیژە بێت کە کورد ئاڵوگۆڕی بە داواکاری و ئامانج و بەرژەوەندییەکانی نەکات،

وەکو وتمان لە سەرەتادا کوردی کوردستانی خواروو لەسەر شان و هیلاکی و ماندووبوون و عارەقی ناوچەوان و خوێنی شەهیدان، شۆڕشی ئەیلوولی دروستکردو پەرەی پێداو بەرەو سەرکەوتن و پێشکەوتنی برد، لە هەموو ڕوویەکەوە کوردەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات و سەرووش بە ڕێکوپێکی و دڵسوزانە پەیوەندی خۆیان بەهێز کردبوو لەگەڵ شۆڕش، بە دڵ و دەروونێکی پڕ لە

هیواو ئومێدەوە دەیانڕوانییە سەرکەوتنەکانی شۆڕشی ئەیلوول. کوردەکانی کوردستانی سەروو (تورکیا) بە گیان و کەلوپەل و ئازووقەو پێداویستی تری شۆڕش، هاوکارییەکی گرنگیان دەکرد لەگەڵ شۆڕش بۆ پتەوکردن و بەهێزکردن و سەرکەوتنی. تەنانەت لە هێرشە دڕندانەکەی داگیرکەر بۆ سەر پێشمەرگە لە ساڵی ١٩٦٣ لە ناوچەی (مەتین)دا کوردەکانی سەروو شانبەشانی براکانیان لە پێشمەرگەی کوردستانی خواروو ڕۆڵێکی کاریگەرو نەبەزانەیان نواند بۆ تێکشکاندنی هێرشە گەورەکەی داگیرکەرو سەرکەوتنی پێشمەرگەو پاککردنەوەی ناوچەکە لە دوژمن، کوردەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵاتیش (ئێران)، لە یەکەم ڕۆژی دروستبوونی شۆڕشی ئەیلوولەوە لە هاوکاریکردن دوا نەکەوتوون (حزبی دیموکراتی کوردستان) زۆربەی سەرکردەو کادیرو ئەندامەکانی لە ڕیزی شۆڕش و پێشمەرگەدا چەکیان هەڵگرتبوو بە سکرتێرەکەیانەوە (ئەحمەد تۆفیق) بوو یارمەتییەکانی خۆیانیان ڕاستەخۆ دەگەیاندە شۆڕش، بەگوێرەی تواناو باردۆخ درێغییان نەدەکرد لە کۆکردنەوەی پارەو ئازووقەو چەک و فیشەک و جلوبەرگ لە کوردەکانی کوردستان ڕۆژهەڵات. سەرەڕای ئەوەی سەرکردەو کادیرو ئەندامە چالاکەکانیان بە سکرتێرەکەشیانەوە لە کاری سیاسی و سەربازی گرنگدا بوون لە دەزگاکانی شۆڕشدا بۆ سەرکەوتنی شۆڕشی ئەیلوول، بەتایبەتی لە ناوچەکانی سۆران و بادینان و بارزاندا. لە زۆر کاتدا ئەم سەرکردەو کادیرو ئەندامانە لە ناوچەکان سۆراندا دەگێران لەلایەن (مەکتەبی سیاسی)، لەبەر چالاکییان کە لەژێر چاودێریی بارزانیدا بە ئەنجامیان دەگەیاند.

ئەم کوردە ڕۆژهەڵاتییانە (ئەحمەد تۆفیق و برادەرەکانی) ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە نزیککردنەوەی ئێمەو کوردە نەتەوەییەکان لە (بارزانی)، بەتایبەتی لە بارەگای بارزانی. کە لە پێشتردا ئاماژەم پێدابوو، تەنانەت خەتێکی تایبەتیان دروستکردبوو لە ناوچەی سۆران بۆ گەیاندنی یارمەتی و کۆمەک بۆ پێشمەرگەکانی بادینان و بارزانی و وەرگرتنی دەنگوباس و زانیاری. هەروەها دەرکردنی نووسراوێک بەناوی (دیسان بارزانی) دەردەکرد بەیارمەتی ئێمە لە (لاوانی نەتەوەی کورد)، بڵاوکردنەوەی لە ناوچەی سۆراندا کە مەکتەبی سیاسی دەسەڵاتدار بوو تیایدا، دەنگوباسەکانی پێشمەرگەی بادینان نەدەبیسترا. هاوکات کارو هەڵویستەکانی (ئەحمەد تۆفیق و برادەرەکانی) ئەوە بوو بە داوایەکی فەرمی، داوای یەکخستنی هەردوو حزبی دیموکراتی کوردستان ڕۆژهەڵات و باشووریان کرد، بەڵام بەداخەوە مەکتەبی سیاسی پارتی کە لە ماوەت بوون، ئەو داوایەیان پەسەند نەکرد. لە کۆنگرەی شەشەمی پارتیدا لە قەڵادزێ دووبارە ئەحمەد تۆفیق ئەو داوایەی دووبارەکردەوەو ڕەخنەی لە مەکتەبی سیاسی پێشوو گرت کە پەسەندیان نەکردووەو کاریان بۆ نەکرد، بەڵام ئەندامانی کۆنگرە بێدەنگ بوون و هیچ وەڵامێکیان پێ نەبوو.

ئەحمەد تۆفیق و برادەرەکانی لە دامودەزگاکانی شۆڕش لای بارزانی و پێشمەرگە ڕۆڵێکی گرنگیان دەگێڕا لە ناوەوەو دەرەوەی کوردستان. هەر لەو برادەرانەی حزبی دیموکرات لە هەندێک سەرکردەو کادیریان کە بەرەو باوەڕی نەتەوەیی هەنگاویان دەنا لەناو ڕۆژهەڵاتی کوردستانی ئێراندا بە دەستپێشخەریی ئێمە لە

(لاوانی نەتەوەی و قوتابیانی نەتەوەیی) ڕێکخستنێکی سیاسیمان لەگەڵدا تەشکیل کردن بەناوی (کۆمەڵەی ڕزگاری)، ئەمانەش بەگوێرەی تواناتایان دریغییان نەدەکرد لە یارمەتیدانی شۆڕش و بارزانی لە هەموو بوارەکاندا، چ سەربازی، یان ئابووری. ئەم کوردە نەتەوەییانەی ڕۆژهەلات زۆربەیان تا ڕێککەوتنەکەی (جەزائیر) لە ڕیزی شۆڕشدا بوون. داگیرکەری عێراق هەندێکیانی گرتن و تەسلیمی ڕژێمی ئێرانی کردنەوەو هەندێکشیان بە پیلان کۆمەڵەکەی (قاسملو)، کە ئەوکاتە لەبەغدا بوون، لەگەڵ موخابەراتی عێراق ئیشیان دەکردو ئەو سەرکردانەیان لەسێدارە دران وەکو (ئەحمەد تۆفیق)و چەند برادەرێکی تر لەگەڵیدا.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەم کوردانەی ڕۆژهەلات پەیوەندی زۆر بەهێزیان هەبوو لەگەڵ بەندە، بەتایبەت ئەحمەد تۆفیق) زۆر هاوکاری ئەو جولاندنەوە نەتەوەییەی ئێمەیان دەکرد، هاوکات (کۆمەڵەی ڕزگاری) پەیوەندییەکی زۆر باشیان لەگەڵماندا هەبوو، زۆربەی بلاوکراوەو ڕۆژنامەکانمان لەگەڵ بەیاننامەکانمان لە ڕێگەی ئەم کوردە نەتەوەییانەی ڕۆژهەلات بلاو دەکردەوە.

**- ئێران و ئەمریکاو یارمەتییەکانیان بۆ شۆڕشی ئەیلوول**

ڕژێمی ئێران هەر لە کۆنەوە، لە دروستبوونی ئیمپراتۆرییەتی (سەفەوی)یەوە لە بەشکردنی یەکەمی کوردستانەوە لە شەڕی (چالدێران) سالی ١٥١٤-وە دەستیان لە بەشکردنی کوردستاندا هەبوو، مانەوەی بەمجۆرەی ئێستای پارچەی ڕۆژهەلات بە داگیرکراویی لەژێر چنگیاندا بووە. تەنانەت کورد لە هەموو مافێکی نەتەوەیی و مرۆڤایەتی بێبەشەو ڕێگای بەدەستهێنانی کەمترین

و بچووکترین مافی لێگیراوە. تەنانەت لە زۆر کات و بارودۆخدا بە بەشێک لە (فارس) ناوی دەبەن. سەرەڕای ئەوەی هەرکاتێک هەستیان بە جموجۆڵ و جوڵاندنەوەیەکی کورد، یان شۆڕشێکی کورد کردبێت، ئەمانە بە کوشندەترین چەک و هێرشی گەورەو دڕاندانە ڕووبەڕووی بوونەتەوەو پەلاماری کوردیان داوە. تا توانیویانە کوردیان قەڵاچۆ کردووەو کوردستانیان کاول و وێرانکردووە، تەنانەت ئاوڕیان لە فشەمافێکی ژیانی کوردەواری نەداوەتەوەو پەلاماری ناپیاوانەو پڕ لە فڕوفێڵەکانیان بۆ سەر شۆڕشی سمکۆو لەناوبردنی سمکۆو چۆنییەتی شەهیدکردنی چەندەها سەرۆک و سەرکردەی لێهاتووی کورد، تا دەگاتە ڕووخاندنی کۆماری مەهابادی خوێنین و کپکردنی هەموو دەنگ و جۆڵاندنەوەیەکی شۆڕشگێڕی کوردپەروەران و ناودارە ئاینییەکان. باشترین بەڵگەی دوژمنایەتی و داگیرکەری ئێران بۆ مەسەلەی کورد ئەمە بوو سروشتی دەوڵەتی ئێران، لەملاشەوە یارمەتیدەری شۆڕشی ئەیلوول بوو بە چەک و پێویستی شۆڕش و ئازووقەو پارە.

سەرەتا یارمەتییەکانی ئێران بۆ شۆڕش ئەیلوول دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٢، بۆ پەیوەندی مەکتەبی سیاسیی پارتی کە بڕی (٥٠) هەزار دیناری وەرگرتنی چەکی بڕنەو و فیشەک، هەندێک یارمەتی کەلوپەل و داوودەرمان و ئازووقە بوو. ئەم یارمەتییانە لەنێوان ئێران و مەکتەبی سیاسیدا بوو بێ ئاگاداری بارزانی، تا کاتی هاتنی بەعس بە کودەتاکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بە لەناوچوونی (عەبدولکەریم قاسم) و تەفروتووناکردنی شیوعی ئێران، تەنانەت

بۆ پارمەتیدانی بەعس و ڕاویژکردنیان بە چەند ئەفسەرێکی پایەبەرزی ئێرانی بۆ یارمەتی و نەخشەکێشانی سەربازی هاتنە عێراق.

ئەو یارمەتییانەی ئێران بۆ مەکتەبی سیاسی، بەبێ ئەوەی لەبەر ڕۆشنایی بەرژەوەندی کورد نەخشەی بۆ بکێشرێت، وەردەگیران، مەکتەبی سیاسی وا لێکرد کە غروور ببن و حەجمی خۆیان بیر بچێتەوەو بەرەنگاری بارزانی بوەستن. بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٦٤ کە پەیمانی شەڕ وەستاندن لەنێوان بارزانی و عەبدولسەلامدا مۆرکرا.

ئەو یارمەتییانەی ئێران دووبەرەکی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی گەورە کرد، لەئەنجامدا ئەو ناکۆکی و دژە وەستانەی دروستکرد لەناو ڕیزەکانی پارتی و شۆڕش و پێشمەرگەو سەرۆک و سەرکردەکاندا، کە بەرامبەر یەک لە سەنگەری دووبەرەکیدا بوون و کەمتەرخەمییان لەیەک نەدەکرد لە دژایەتی بۆ یەکتری. ئەو سەنگەرەی تا دوێنێ هەموو پێشمەرگەو پارت و کۆودپەروەرێک یەک دڵ و یەک گیان لەناویدا پارێزگارییان لە شەرەف و ناموسی کورد دەکرد بۆ پاراستنی قەوارەی نەتەوەیی و بەیەکەوە گیانیان دەبەخشی بە کوردو سنگیان کردبووە قەڵغان لە ڕێگەی کوردستاندا، کەچی ئەو یارمەتییانەی ئێران وایان کرد لوولەی چەکەکانیان ئاڕاستەی سنگی پاک و پووختەی پێشمەرگە قارەمانەکانیان بکەن.

ئێران و مەکتەبی سیاسی بەهەڵەدا چووبوون، ئەوەبوو ڕاونرانە ئەودیو سنووری کوردستانی خواروو و بەرەو کوردستان ڕۆژهەڵات، پاش ئەوە یارمەتییەکانی ئێران بۆ مەکتەب سیاسی بووە هۆی هاندانیان بۆ هێرشهێنان و پەلاماردانی ناوچە ڕزگارکراوەکانی

سەر سنوور، بەڵام بێ سوودو بێ ئەنجام، پاشان ئێران کە بۆی ڕوونبووەوە مەبەستەکانی ئێران بە مەکتەبی سیاسی نایەتەدی و بارزانی خاوەن بڕیارو سەرکەوتنە، بۆیە ئەو کۆمەڵەی مەکتەبی سیاسی دوورخستەوەو یارمەتییەکانی ئێران بەزیادەوە بەرەو بارزانی ڕەوانە کران.

دەبێت ئەوش بزانین کە بارزانی (سزای لەسێدارەدانی) هەبوو لە ئێراندا، پاش تێکچوونی کۆماری مەهاباد. پاش شەڕکردنەوەی ساڵی ١٩٦٥ ئێران کەوتەوە چەک ناردن و پارەو داوودەرمان و ئازووقە. هەروەها ڕێگەی بە برینداراو نەخۆشەکانی شۆڕش دا بۆ ناو شارەکانی ئێران بەمەبەستی ئیشوکارو تەداویکردنیان، هەروەها ڕێگەی ئەو ئێستگەیەی دا کە شۆڕش کڕیبووی لە دەرەوە کە بە ئێراندا بێتە ناوچە ڕزگارکراوەکان.

هەروەها چەند هاوەن و پارچە چەکێکی بەتوانای دا بە شۆڕش، پاش ئەوەی (مەکتەبی سیاسی و جەلالییەکان) لەگەڵ (بەزاز) ڕێککەوتن و گەڕانەوە. بەزاز ویستی لەژێرەوە بەنهێنی لەگەڵ ڕژێمی ئێران ڕێکبکەوێت. کاتێک بارزانی هەستی بەوەکرد لە مانگی تەمموز، پاش ئەوەی لەلایەکی ترەوە بەزاز نوێنەری خۆی بۆلای بارزانی ناردبوو، بارزانی بڕیاری دەرکردنی بەیانی ٢٩ی حوزەیرانی دا.

ئێران ئەو ڕێککەوتنەی بارزانی و بەزازی لا پەسند نەبوو، چونکە لەکاتی پەیوەندی (بەزاز) بە ئێرانەوە بۆ ڕێککەوتن تێیدا (قەپاڵی) گەورەی گرتبوو. لەو باوەڕەشدا نەبوون کە بارزانی بێ ئاگاداری ئەوان دەستپێشخەریی بکات لەگەڵ ڕژێمی عارف و بەزازداو بەو

زوویە ڕێکبکەوێت، تەنانەت لە سەردانەکانیاندا لەگەڵ بارزانی ئەو یارمەتییانەیان دەدایەوە بەچاوی بارزانیدا، کە بە هاتنی بارزانی بۆ ناوچەی (پێنجوێن) دامودەزگاکانی عێراقیان پێ بۆردوومان کردو زەرەرو زیانێکی زۆریان لەو سەربازگەیانە دا.

ئێران کەوتە کەمکردنەوەی یارمەتییەکانی، تا هاتنی بەعس لە ساڵی ١٩٦٨، ئێران جۆرە مەبەست و تەماعێکی تری هەبوو کە بریتی بوو لە دەستگرتن بەسەر هەموو (دوورگەی فارس) دا، بەتایبەتی (شط العرب)، هەروەها سەرشۆڕکردن بە بەعس بۆ داواکانی ئێران. کاتێک بەعس بۆ دواجار ویستی گەورەترین هێرش بکاتە سەر بارزانی و شۆڕش بەیارمەتی هەزارەها (جاش) و کۆمەڵی (جەلالییەکان)و سەربازو تانک و تۆپ و فڕۆکەی جەنگی پێکهاتبوون.

ئا لەم کاتەدا ئێران کەوتەوە ناردنی یارمەتییەکان بۆ شۆڕش و پێشمەرگەو توانی لە هەموو شەڕەکاندا سوپای داگیرکەرو جاش و دەست و پێوەندو (جەلالییەکان) شپرزە بکات و بەرەو شکان و سەرشۆڕی ڕاوەدوویان بنێت. تەنانەت لە ناوچەی دووکان هێرشی گەورە کرایە سەر سەربازگاکانی و گەورەترین دەستیان لێوەشاندن و چەند ئەفسەریان لێ بەدیلگرتن. شۆڕشی بارزانی بەرەو سەرکەوتن دەچوو و داگیرکەرو جاش و دەست و پێوەند بەرەو ژێرکەوتن و پووکانەوە چوون. ئێران لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠ بەهۆی ئەو ئەفسەرانەی دژی بەعس بوون، خەریکی پیلان بوو بۆ کەوتنی بەعس، ئەو پیلانە ئاشکرابوو و سەری نەگرت، (٤٠) ئەفسەری سوپای عێراق لە هەموو جۆرە پلەیەک ڕەمیکران

و هەندێکی تریان حکومی جۆراوجۆر دران و هەندێکیان هەڵهاتن بۆ ئێران.

بە سەرنەکەوتنی ئەم پیلانە ئێران یارمەتییەکانی بۆ شۆڕش زیاتربوو، بەڵێنی زیاتریشی دەدا، پاشان ئەوە بوو بەعس بە کاروباری سەربازیی نەیتوانی شۆڕشی کورد لەناوبەرێت. پاشان بەعس کەوتنە نزیکبوونەوە لە شۆڕش و گفتوگۆ لەگەڵ بارزانیدا. ئەوە بوو ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ مۆرکرا. بە بڵاوکردنەوەی ئەو بەیانە ئێران دڵگران بوو، ئەو ڕێکەوتنەی بارزانی بە نارەواو خراپ دانا بۆ بەرژەوەندی ئێران و سیاسەتی ئێران و بەرژەوەندییەکانی.

ئێران لەوە دەترسا کە بارزانی لە ڕێگای بەعسەوە هەنگاو بنێت بۆ دروستکردنی جۆڵاندنەوەو هەستان بە کارو کردەوەی تێکدەرانە دژی دەزگاکانی ئێران. بۆیە ئێران بە ناچاریی نەیویست ئەو پەیوەندییەی هەیەتی لەگەڵ شۆڕشی بارزانی تێکی بدات، ئەوەی ڕاستی بێت بۆچوونەکەی ئێران لەجێی خۆیدا بوو، چونکە بەعس لە سەرەتای ڕێککەوتنەکە لەگەڵ بارزانیدا داوایان کرد کە ڕێگا بدرێت هاوکارییان بکەن بۆ جموجۆڵ و کاری سەربازی دژی ئێران بەیارمەتی پێشمەرگە. بارزانی ئاگاداری بەعسیان کرد کە شۆڕش و پێشمەرگە ڕێگەیان لێ ناگرن، بەڵام پێشمەرگە لەو کردەوانە هاوکارییان ناکات. بەعس چەند مەفرەزەیەکی دەزگاکانی (ئەمن و ئیستخباراتی و مەخابەراتی) لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستانەوە کرد بە سنووری ئێراندا، لە کوردستان ڕۆژهەڵاتەوە. ئەم مەفرەزانە بێئەوەی بتوانن کارێک ئەنجام بدەن، زۆربەیان

تەفروتوونا بوون و یەک کەسیان بە سەلامەتی نەگەڕانەوە، پاشان بەعس ئەو کارانەی وەستاند.

ئێران بۆی دەرکەوت کە شۆڕشی بارزانی یارمەتی ئەو مەفرەزانەیان نەداوە، کەوتنە نزیکبوونەوە لە بارزانی یارمەتییەکانیان هەر بۆ شۆڕش دەنارد. تەنانەت پاش پیلانە گەورەکەی بەعس بۆ لەناوبردنی بارزانی، ئێران زۆر بەزیادەوە یارمەتی بارزانی و شۆڕشی دەنارد، هەمیشە ئەوەیان بە بارزانی ڕادەگەیاند کە بەعس درۆ لەگەڵ بارزانی و شۆڕش دەکەن. مەبەستیان لەناوبردنی شۆڕش و بارزانییە. لەڕاستیدا ڕووداوەکان ئەو ڕاستییەیان دەسەلماند کە بەعس هەر خەریکی پیلان و تەعریب و تەبعیس و دوورخستنەوەی کوردە لە کوردستان و بڵاوکردنەوەی دەست و پێوەندو پارەو پلەیە بۆ کڕینی ئەڵقە لەگوێ و هاندانیان دژی پێشمەرگەو بارزانی و شۆڕش.

ئێران بەڵێنی دا بە شۆڕش و بارزانی کە هەوڵدەدا لەناو دەوڵەتان دۆست بۆ ماف و مەسەلەی کورد پەیدا بکات. هەروەها بە بارزانی ڕاگەیاند کە ئەمریکا لە هەموو ڕوویەکەوە یارمەتی شۆڕشی بارزانی دەدات. چ سیاسی، یان سەربازی بێت، یان بە پارەو پێویستی ئازووقەو کەلوپەلی داوودەرمان بێت، تەنانەت شا بە بارزانی و شۆڕشی وا گەیاندبوو کە ئەم شەڕکردنەیان لەگەڵ بەعس بە چەکی تازەو تۆپ و دەبابەو فڕۆکەی قورس و گەورە دەبێت. کورد خۆی دەبێتە خاوەنی ئەو چەکانە. ڕۆژنامەکانی ئێران و تورکیاو ئەمریکا ئەم دەنگوباسانەیان بە مانشێتی گەورە گەورە لە ڕۆژنامەکان بڵاو دەکردەوە، کە شۆڕشگێڕانی کورد بارزانی لە

شەڕی نوێدا جۆرەها چەکی نوێ بەکاردەهێنن.

لەلایەکی ترەوە، کردەوەکانی بەعس وای لە بارزانی و کورد کرد کە بەهیچ جۆرێک بڕوایان بە بەڵێنی داگیرکەرو بەعسییەکان نەمێنێت و پەسەندی هەموو یارمەتییەکی دەرەکییەکان بکات. ئەو یارمەتییانەش بەرەبەرە دەگەیشتە بارزانی و شۆڕش، بەتایبەتی لەکاتی دەستپێکردنەوەی شەڕدا. پارەیەکی زۆر بەناو شۆڕشدا بڵاوکرایەوە. شۆڕش و بارزانی هەروەکو دامودەزگای ڕژێم و دەوڵەتێک مووچەی بۆ هەموو ئەو خەڵکانەی هاتبوونە ڕیزی شۆڕشەوە، پێیان دەدرا، سەرەڕای پێشمەرگەو کاربەدەستان و ئەندام و کادیرەکان و تەنانەت یارمەتی ئەو خێزانە کوردانەی دێهاتەکانیش کە لە ناوچەکەیاندا بۆردوومان و تۆپباران کرابوون و شەڕیان تیا دەکرا، هاوکاری دەکران.

لێپرسراوان و کاربەدەستە بەدەسەڵاتەکانی ناو شۆڕش بەڕاست و چەپدا گیرفانیان پڕ دەکرد، تەنانەت هەندێکیان دەست و پێوەندو مەحسوبەکانیشیان بێبەش نەدەکرد لەو لێشاوە پارەیە. ئەوانەی کە کەمتر سوودمەند دەبوون لەو پارەیە، پێشمەرگەو ئەو کوردە دڵسۆزانە بوون لەگەڵ ئەو (شیوعیانە) کە مابوونەوە لەناو شۆڕشدا (کۆمەڵەی قیادە مەرکەزی)و لەگەڵ چەند کوردێکی نەتەوەیی، کە تێکڕا ئەمانە ڕەخنەیان لەو جۆرە لێشاوەی لێپرسراوان دەگرت، دەیانویست شۆڕش جڵەوی لەدەست کوردا بێت، ئەم بێسەروبەرییە دۆخێکی دروستکردبوو لەناو شۆڕشدا، کە خەڵکی بڕوای بە شۆڕش لاواز ببوو، هەروەها هەوڵی خۆ نزیککردنەوە بدەن لەم لێپرسراو و ئەو بەدەسەڵاتانەو گیانی بڕوا بەخۆبوونیان تێدا

مردبوو. تەنها ئەو خاوەن بڕواو متمانانەی کە هەبوو، ئەو کوردە پاک نەتەوەییانە بوون مابوونەوە، بەڕاستی ئێمە دڵمان دەسووتا بەو کارو هەڵوێستانەو یاریکردن بە دوارۆژی کوردو خوێنی ئەو شەهیدانەی بەدڵگەرمییەوە بەرەو گیانبەخشین چووبوون، تەنانەت شۆڕشگێرییەتی لەبیر چووبووەوە، لێپرسراوان و بەدەسەڵاتەکانی شۆڕش لە شارە گەورەکانی ئێراندا بەجۆرێک دەژیان لەگەڵ خاووخێزان و کەسوکارو دەست و پێوەندەکانیان، وەکو لە وڵاتێکی ئەوروپادابن وابوو جۆری ژیانیان.

ئەو خەڵکە زۆرەی کە هێنرابوونە دەرەوە بۆ ناو شۆڕش لە شارەکانی کوردستانی ئێران و شارەکانی تری ئێراندا، خەریکی خەرجکردنی ئەو پارە زۆرەی شۆڕش بوون، بە ڕابواردن و خواردنەوە، تەنانەت کۆڕی قومارکردن دروستببوو لەناو کاربەدەستانی شۆڕشدا. پێشمەرگەی ڕەشوڕووت و گیانفیداو ئازاو نەبەز لە سەنگەری پاراستنی قەوارەی نەتەوەییدا بە سەرماو گەرما چاوەڕێی مەرگیان دەکرد. لەلایەکی تریشەوە هەموو جموجۆڵ و کارو کردەوەیەکی سەربازی پێشمەرگە بەسترابووەوە بە بڕیارو فەرمانەکانی ئێرانەوەو شەڕی بێهێزکردنی بەعس بە کورد دەکرا.

دەزگا سیاسی و سەربازییەکانی شۆڕش لەبەر ڕۆشنایی بەرژەوەندی و سودی ئێران دەجوڵانەوە. ئەو چەکە تازەو قورسانەی بەڵێنیان دابوو بە دەبابەو تۆپ و فرۆکەشەوە خەو و خەیاڵ بوون، ئەو تۆپە گەورەو گرانانەی ئێران هاتبوونە ناوچە ڕزگارکراوەکان ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو کاتێک بەکاردەهێنران لە شەڕەکاندا. زۆر چەکی تری دژە بەرگری فرۆکەو تانک کە پەیمان

درابوو بگاتە شۆڕش لە سەرەتای شۆڕشدا هەر نەدەگەیشت، یان کاتێک دەگەیشتن بەعس گەیشتنە ڕەواندوز، لەپاش ئەوە پێشمەرگەی نەبەز ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لە بەکارهێنانی ئەو چەکانەدا، بەڵام پاش پێویستی لەکاتی خوێدا نەدەگەیشتە دەست پێشمەرگە، کاتێک دەگەیشت بەبێ سود دەمانەوە، یان سودێکی گرنگیان نەبوو. هەموو بەکارهێنان و تەقاندنی چەکێکی قورس و تۆپە گەورەو گرانەکان، دەبووایە بەڕەزامەندی ئەفسەرە ئێرانییەکان بووایە.

لەملاشەوە گیانبەخشین لەناو پێشمەرگەدا بەرەو کزیی دەڕۆیی کە پێشمەرگە دەیبینی ئەو خەڵکە زۆرە لە شارەکانی ئێراندا بە پارەیەکی زۆرەوە بێئەوەی بەردێک بخنە سەر بەردێک بۆ شۆڕش، خەریکی ڕابواردن و خواردنەوەو قۆمارو خۆشگوزەرانین، ئەمانیش لە سەنگەری پارێزگاری لە ئابڕووی ئەواندا و لە سەنگەری پیاوەتیدا بە شەونخونی و برسێتی هیلاکی و ماندووبووندا بوون. پاشان پێشمەرگە کەوتبوونە گلەییکردن، گلەییەکانیشیان بەجێ و لە شوێنی خۆیدا بوون، کە ئەم گلەییانە دەگەیەنرانە لێپرسراوان و بارەگای بارزانی، بەبێ وەڵام دەمانەوە...

لە زۆر ناوچەی کوردستاندا کە سەرکەوتنی پێشمەرگە مسۆگەر بوو، هێرشکردنە سەر بارەگاکانی داگیرکەر بەگوێرەی سیاسەتی لێپرسراوانی شۆڕش و ئێران، ڕێگای ئەو هێزو بەتالیۆن و لق و پێشمەرگانە نەدەدرا کە بەرەی تازە بکەنەوە بۆ ڕووخاندنی داگیرکەر، تەنها بە بڕیاری سەربەخۆو هاندانی چەند لێپرسراوێک لە ئامر هێزو بەتالیۆنەکان جارجار مەفرەزەیەک چالاکییان دەنواند،

بەڵام شەڕی گەورەو گرنگ کە مەبەستی ئێران و لێپرسراوانی شۆڕش بوو لەبەرەی (ڕەواندوز)، بەگەرموگوڕی بەردەوام بوو.

شا زۆرجار ئاگاداری بارزانی و شۆڕشی دەکرد کە دەیەوێت پرۆژەیەکی (حکومی ذاتی) بۆ هەموو کوردستان بنیات بنێت بە یارمەتی ئەمریکا. بۆیە داوای لە بارزانی کرد کە ئەو پرۆژەیەی شۆڕش ئامادەی کردووە بۆ کوردستانی خواروو، بڵاوی نەکەنەوە. لە مانگی حوزەیرانی ١٩٧٤دا چەند نوێنەرێکی شۆڕش نێردران بۆ ئەمریکا، پاش وتووێژکردن لەگەڵ کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، بەئاشکرا ئەو کاربەدەستە بە نوێنەرە کوردەکانی ڕاگەیاندبوو کە مەبەستی (ئەمریکا گۆڕینی سیاسەتی عێراقەو هیچی تر)، بە گۆڕینی ئەو سیاسەتە داوا لە کاربەدەستانی عێراق دەکەین (مافە ناوخۆییەکان) لە عێراقدا بڕیارو جێبەجێ بکەن.

چۆنێتی دروستبوونی بەعس و سروشتی بەعسییەکان لەبەرئەوەی لە قوتابخانەکانی (موخابەراتی ئەمریکی و ئینگلیزی)دا ڕاهێنرابوون لە هەموو ژێرکەوتنێکدا بەلایانەوە گرنگ نییە سەرشۆڕو سەرنەویکردن. هەرچی نرخ و ڕەوشتی سیاسی و سەربازییە بیخەنە ژێر پێوە لەپێناو مانەوەیان لە ڕژێم و دەسەڵاتدا. بۆیە سەدام و دارو دەستەکەی کە هەستیانکرد بە بەردەوامی لە شەڕی کوردستان بەرەو کەوتن دەچن، بۆیە بەخێرایی بۆ ڕزگارکردنی خۆیان کەوتنە پەیوەندیکردنی جۆراوجۆر بە (بومەدین- سەرۆکی جەزائیر، تیتوو- سەرۆکی یوگسلافیا، مەلیک حسێن- شای ئەردەن، ئەنوەرسادات، سەرۆکی میسرو مەلیک سعود بۆ نزیکبوونەوەیان لە ئێران و ئەمریکا. تەنانەت چەند نوێنەرێکیان ناردە ئەمریکا کە

یەکێکیان (بارزان تکریتی) بوو، برای (سەدام حسێن)، هەروەها بە نزیکبوونەوە لە ئێران و یەکتر بینینی لێپرسراوانی هەردوو ڕژێم (بەعس و ئێران) لە تورکیا، کە شۆڕش و بارزانی بەم جموجۆڵ و هەوڵ و تەقەلایەی بەعسیان زانی، داوایان لە ئێران کرد کە ئایا ڕاستە ئەو یەکتربینینەی ئێران و بەعس لە تورکیا. نوێنەرەکانیشیان بە بارزانی و نوێنەرەکانی شۆڕشیان ڕاگەیاندووە کە ئێران و عێراق بە هەرجۆرێک ڕێکبکەون، دژی خواستەکانی کوردو لەسەر حسابی مەسەلەی کورد نابێت. هەروەها سەدام حسێن لە کۆنگرەی سەرانی عەرەب لە (ڕیباتی پایتەختی وڵاتی مەغریب) داوای کرد کە هەوڵ بدەن بۆ نزیکبوونەوەیان لە ئێران و ئەمریکا بۆ ڕزگاربوونیان لە شۆڕشی کوردستان. سەرانی عەرەبیش بڕیاریان دا کە (ئەردەن، میسرو سعودیە) بەم کارە هەستن. ئەم سێ دەوڵەتە هەریەکە پێویستییەکی خستە سەر شانی (ئەردەن)، کە بەرەو ئەمریکا هەنگاو بنێت، (عەرەبستانی سعودیە) بەرەو ئێران و (میسر)یش هەوڵ بدات بۆ یارمەتیدانی عێراق لە یەکتر بینینیان لەگەڵ لێپرسراوانی ئێران لە تورکیا.

پاش کۆبوونەوەی نوێنەرانی عێراق و ئێران لە تورکیا. لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسیدا وەزیری دەرەوەی ئێران وتی (ئەگەر دوو لا لەسەر لایەنی سێیەم لەگەڵ یەکتر تێکچوون، ئەوە گومانی تێدا نییە ڕێککەوتن لەسەر حسابی لایەنی سێیەم دەبێت و زیانی پێدەگات). هەر لەم کاتەدا بارزانی کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ لێپرسراوانی پارتی و شۆڕش کرد لەبەر ڕۆشنایی ئەو جموجوڵانەی کە لە کۆبوونەوەکاندا دەبینرا، بۆیە لەو کۆبوونەوەدا

بارزانی وتی: (لەڕاستیدا مەسەلەکە بەدەست ئێران نییە، ڕێککەوتن، یان ڕێکنەکەوتن، چونکە ئەگەر ئێران بووایە ئەوا زۆر بەئاسانی ڕێکدەکەوت، مەسەلەکە لە ئێران گەورەترە کە دەستی لەم کارەدایە). لێپرسراوانی پارتی و شۆڕش هەریەکە بۆچوونێکیان هەبوو، تەنانەت هی واشیان هەبووە زۆر بێئاگا بووە وەکو (گوێزی بۆ بژمێریت، وابوو، ئەو بەس گوێی لە خڕەکەی بێت).

ئەم لێپرسراوانەی شۆڕش و پارتی هەرچەند کۆبوونەوەیان کرد، بۆیان نەکرا نەخشەو پلانێک بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو بارودۆخە دابنێن و لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیەکی ڕاست و واقیعی بدۆزنەوە بۆ ڕزگاربوون لەو دوارۆژەی شۆڕشی کورد بەسەریدا هات. کاتێک شای ئێران لە (میسر) گەڕایەوە، پاش بڵاوبوونەوەی دەنگوباسی و هەواڵەکە گوایە شا باسی مەسەلەی کوردی کردووە بە نوێنەرانی بارزانی و شۆڕشی وتووە دەبێت مەسەلەی کورد بەڕوون و ئاشکرایی چارەسەر بکرێت.

لە مانگی شوباتی ١٩٧٥ نوێنەرانی بارزانی و شۆڕش بۆ ڕاستی مەسەلەکە و بینینی (ئەنوەر سادات) چوونە میسر، (سادات) پێ ڕاگەیاندن کە (شا زۆر پەرۆشە چارەسەری مەسەلەی کورد بکات، من دڵنیاتان دەکەم کە هەوڵ و کۆششی ئێمە بۆ ڕێکخستنی عێراق و ئێران زیانی بۆ ئێوە نییەو مافەکانیشتان پارێزراو دەبێت، شای ئێران لەسەر حسابی ئێوە ڕێکناکەون). تەنانەت لەو کاتەدا هەندێک لەو نوێنەرانە وایان بڵاودەکردەوە کە چوونیان بۆ میسر بۆ ڕێکخستنی کوردو بەعسە، بەڵام لێپرسراوانی دیکەی شۆڕش و پارتی ئەو بەندوباوەیان بەدرۆ دەخستەوە.

تەنانەت (محەمەد حسێن هەیکەل) لە نوێنەری کوردی پرسیبوو (ئەگەر ئێران و عێراق ڕێکەوتن ئێوە هەڵوێستتان چۆن دەبێت)، ئەوانیش لە وەڵامدا وتبوویان (شەڕ دەکەین تا دوا پێشمەرگە)، ئەم جموجوڵانەی بەعس وەکو لێپرسراوانی شۆڕش و پارتی تێیگەیشتبوون، بەندوباو نەبوون، بەڵکو سەرەتای ڕێککەوتنەکە ڕۆژ بەڕۆژ دەردەکەوت، ئەم لێپرسراوانەش زۆرینەی بێ ئاگاو ئاڵۆز بوون. تەنانەت نەیاندەزانی هیچ جۆرە لێکدانەوەو هەڵوێستێک دیاریی بکەن، ئەوەبوو ڕێککەوتنەکە مۆرکراو بڵاوکرایەوە.

خەڵکە ڕەشوڕووت و پێشمەرگە ئازاکانی کورد وەکو مێگەلە مەڕ بەبێ شوان و خاوەن هەرکەسەو دەستەیەک بەرەو شارو ناوچەو لایەک دەڕۆیشتن. بە سەرسوڕمانەوە نەیاندەزانی بەرەو کۆی مل بنێن بۆ حەسانەوەی مێشک و گیانی شەکەتیان. هەندێ لە بەرپرسەکانی شۆڕش لە شارەکانی ئێراندا خەریکی خواردن و خواردنەوەو ڕابواردن بوون، کەوتنە خۆکۆکردنەوە بەرەو عێراق.

لە لایەکی ترەوە، بارزانی کەوتە هەوڵدان بۆ بینینی شا، لە ناوەڕاستی مانگی ئازار چاوی بە شا کەوت، بە گوێرەی گێڕانەوەی (دکتۆر مەحمود عوسمان)، کە بۆ بەندە و (مولازم کەریمی شێخ سەلام لە نۆکان) ساڵی ۱۹۸۷ گێڕایەوە، دووجار بارزانی شای ئێرانی بینیوە بە ئاگاداری دکتۆر مەحمود. ئەو وتووێژانە بەجێدێڵم بۆ تەواو سەلماندنی و نووسینەوەی بەشێوەیەکی ڕاست.

لەم ڕێککەوتنەی جەزائیردا، ئەمریکا ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە، تەنانەت دەنگ و هەواڵ وا بڵاوبووەوە کە (کیسنجر)و (سەدام حسێن) لە یەکێک لەم پایتەختانە (میسرو سعودیەو ئەردەن)

یەکتریان بینیوەو پەیمانێکی نهێنی لەنێوانیادا مۆرکراوە، نەخشەی سیاسەتێکی نوێ بۆ بەعس کێشراوە، بۆئەوەی پەیڕەوی بکات پاش ڕێککەوتنەکەی جەزائیر. مەبەست و ئاواتەکانی ئەمریکاو ئێران بەهۆی خوێن و هیلاکی و ماندوبوون و کاولکاریی کوردو کوردستانەوە هاتەدی. (شط العرب و ناوچە سنوورییەکان) درا بە ئێران، بڕوا هێنرا بە ئێران کە یەکەم هێزە لە ناوچەکەدا بڕیاربەدەستە. ئەم ڕێکەوتنە شۆڕشی ئەیلوولی پووکاندەوە، بەهۆی باری سیاسیی بەرژەوەندییەکانی نێودەوڵەتان و بێئاگایی لێپرسراوانی شۆڕش و بێ خۆبەستنەوەیان بە نەخشەو بیروباوەڕو ڕێڕەوێکی سیاسی دیاریکراوی سنوور بۆکێشراو. کەواتە ئەم یارمەتی و هاوکارییانەی ئەمریکاو ئێران بۆ شۆڕشی ئەیلوول (تاکتیک بوون و خۆبەدەستەوەدان) دوور بوو لە ڕێککەوتن و پەیمانێکی ستراتیژی نێوان شۆڕش و ئەو یارمەتیدەرانە، لەبەر ڕۆشنایی بەرژەوەندی و دواڕۆژی کوردو شۆڕش و مافەکانی.

شۆڕشی ئەیلوول ئەوەندە دەسەڵاتی ئێران تێیدا بەهێز بوو، تەنانەت پەسەندکردنی کەسانی ناو شۆڕش و سەر بە شۆڕش دەبووایە بە ڕەزامەندی (ساواک) بووایە، نەدەتوانرا ئەو لێپرسراوانەی شۆڕش کە پیاوی ئێران بوون، دوور خرێنەوە لە دەسەڵات لەناو شۆڕشدا. دەزگاکانی (ساواک) ناوی چەند کوردێکی نەتەوەییان دابوو بە دەزگای (پاراستن)، کە بە هاتنی ئەو کوردانە بۆ ناو شۆڕش، بیانگرن و ڕادەستی (ساواکیان) بکەنەوە، بەتایبەتی بەرپرسی ئەوکاتەی ساواک لە شاری (مەریوان)، کە ناوی (ئاغای وەهابی) بوو.

پێشتر باسمان کرد کە (بەندە) داواکراو بووم لەلایەن (ساواکەوە)، تەنانەت (محەمەد ڕەحیم) کە ناسراو بوو (هەڤاڵ جوجەڵە)، دواتر پێمان دەوت (خاڵە حاجی)، هاوڕێیەکی زۆر نزیکی یەکتر بووین، خۆی یارمەتی بەندەو زۆربەی ئەو برادەرە نەتەوەییانەی دەدا پسووڵەی تایبەتی بۆ دروست دەکردین بە ناوی جۆربەجۆرەوە، بۆئەوەی دەستگیر نەکرێین، پاشان کە بڕیاری دەستگیرکردنی من دەرچووبوو، لەلایەن دەزگای (ساواک)ەوە (خاڵە حاجی) بە دوو ناو پسولەی بۆ من دروستکرد بە ناوی (جەمال عەزیزو سەرکەوت بابانی)، بەوە هاتوچۆم دەکرد بۆ پاراستنی گیانی خۆم. هاوکات گرتنی کەسانی نەتەوەیی و ونکردنیان لە زیندانەکانی ئێراندا بۆ ماوەیەکی دووردرێژ، وەکو گرتنی (مامۆستا هەردی)و بەردانی لەسەر داوای لێپرسراوانی ئەوکاتەی شۆڕش، هەروەها گرتنی زۆر کەسی تری نەتەوەیی.

لەپاشاندا بەندەو هاوبیرانم ئەم کێشانەمان دەگەیاندە بارەگای بارزانی و لێپرسراوانی شۆڕش، جارێک بەندە بۆ نموونە چوومە سەردانی کاک (ئیدریس بارزانی)، بۆ ئەم بابەتە لە نزیکەوە باسی دۆخی شۆڕش و باردۆخە نەتەوەییەکانی ناو شۆڕشمان کرد، بەندە داوای دۆزینەوەی چارەسەرێکم کرد، بەتایبەتی لەسەر ئەوەی کە دەزگای (ساواک) بەشوێنمانەوەن و دەیانەوێت کوردە نەتەوەییەکان دەستگیر بکەن، هەموومانیان خستووەتە ژێر چاودێریی وردەوە، لەوکاتەی کە من چوومە خزمەتی کاک (ئیدریس بارزانی) خەریکی نانخواردن بوو (نان و تەماتەی دەخوارد) لە وەڵامدا (تەماتەیەکی ) هەڵگرت فەرمووی مەترسن کەستان ناگرن لە ناوتان نابەن، منیش لە وەڵامدا وتم چۆن؟ داوایان لە دەزگای (پاراستن ) کردووە من

تەسلیم بکرێم لەگەڵ کۆمەڵێ هاوبیری تردا، فەرمووی ئێستا (ساواک) دەزانێت من نان و تەماتە دەخۆم و ئەکید بە دەزانن کە تۆ ئێستا هاتوویتە لای من و زۆر چاک ئاگادارن.

ئەم وەڵامەی (کاک ئیدریس بارزانی) ئەو ڕاستییەی دەسەلماند کە ئەوانەی لە دەوری بوون، واتە کاربەدەستەکانی بارەگای بارزانی بوون، لەوانە (محەمەد عەزیز) کە پەیوەندیدار بوون بە دەزگای (ساواک)ەوە لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئێرانی و زۆربەی هاوبیرانم بەتایبەتی (محەمەد هەرسین و ئەحمەد هەردی)، چەند جارێک منیان ئاگادار دەکردەوە کە ناوبراو پەیوەندی هەیە بە دەزگای (ساواک) ەوە.

دەزگاکانی ئەمنییەت و سەربازیی ئێران بەهۆی ئەو دەسەڵاتانەیان لەناو شۆڕشدا، زۆری لێپرسراوانیان ڕاهێنابوو بۆ هاوکاری لەگەڵیاندا، بەتایبەتی (دەزگای پاراستن)و (ساواک) هاوکارییەکی گرنگیان لەنێواندا دروست ببوو. زۆر لێپرسراوانی شۆڕش و پارتی پێشبڕکێی ئەوەیان دەکرد کە کامیان زۆرترو زیاتر نزیکببنەوە لە حکومەتی ئێران لەلایەن ساواکەوە.

لێرەدا لام گرنگە ڕووداوێکی (ئەحمەد تۆفیق سکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستان-ڕۆژهەڵات)تان بۆ بگێڕمەوە، کە خۆی بەتایبەتی بۆی باسکردم پێش ئەوەی بێسەرو شوێن بکرێت.

وتی (دەزگای ساواک) داوایان لە بارزانی کردبوو کە (ئەحمەد تۆفیق) و برادەرەکانی ئاگادار بکاتەوە کە یەکێک لەم ڕێگایانە هەڵبژێرن، یان بگەڕێنەوە بۆ ئێران بڕیاری لێخۆشبوونیان بۆ دەردەکەین، یان لەناو شۆڕش و پێشمەرگەو ناوچە ڕزگارکراوەکاندا نابێت بمێنن، دەبێت

برۆن، یان واز لە سیاسەت و خەباتکردنی سیاسی و پێشمەرگایەتی بینن و هیچ جموجۆڵێک و چالاکییەکی سیاسی و سەربازییان نەبێت، بە بارزانیشیان وتبوو نابێت ڕێگایان بدەن لای ئێوە بمێنن).

بارزانی ئەو داوایەی ساواکی بە (ئەحمەد تۆفیق) کە سکتێری حزبی دیموکرات بوو، ڕاگەیاندبوو. پێی وتبوو (ئەحمەد ئەم ڕاگەیاندنەی من وەکو تەبلیغی ڕەسمی مەزانە وە باسی مەکە کە من تەبلیغم کردووی، پاش چەند ڕۆژێکی تر من لە ڕێگەی هەندێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، بەتایبەتی (ع.م) تەبلیغت دەکەم، ئەحمەد تۆفیق لێی دەپرسێت دەڵێت قوربان حیکمەت لەوەدا چییە کە بەهۆی ئەو برادەرانەوە، یان (ع.م) ئاگادارم دەکەیتەوە، بارزانی لە وەڵامدا وتبووی، چونکە (ع.م) پەیوەندی بە (ساواکەوە) هەیە لەگەڵ بەشێکی مەکتەبی سیاسی وە پاشان هەواڵ دەبەنەوە بۆ (ساواک) کە من بەدڵنیایەوە تەبلیغی تۆم کردووە، بەهۆیەوە هیچ شک و گۆمانێک نامێنێت لەنێوانماندا).

ئەم ڕووداوە دەتوانین بڵێین دڵۆپێکە لە دەریایەک، سەرەڕای ئەوەی کە بەداخەوە چەند کوردێکی تری کوردستان ڕۆژهەڵات کە هەڵهاتووی ئێران بوون، تەسلیم بە ساواک کرانەوە، وەکو (سلێمانی موعینی)و چەند کەسێکی تر، هەروەها پەیوەندییەکانی شۆڕش و بارزانی بە یارمەتییە دەرەکییەکانەوە کە لەنێوان چەند کەسێک و بارزانی بەولاوە کەسی تر ئاگادار نەبوو لە هەڵسوکەوت و چۆنییەتی ئەو پەیوەندییانە، نەخشەو پلانێک دیاری نەکرابوو سەرەڕای ئەوەی دوور نییە ئەو کەسانەش بەڕاستی و دروستی ئەو پەیوەندییانەیان بۆ سودی خۆیان بەکارهێنابێت، یان وایان لە بارزانی گەیاندبێت کە بۆ سوودی گشتییە.

# بەشی یانزەیەم
# ڕۆڵ و هەڵوێستی نەتەوەییەکان
# لە شۆڕشی ئەیلوولدا

مەبەست لە نەتەوەییە کوردەکان، ئەو کەسانە بوون کە خاوەنی بیروباوەڕی نەتەوەیی کوردن، واتە (کوردایەتی)، ئەو کوردانە بیروباوەڕی نەتەوەیی بە فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیاو ڕێڕەوێکی سیاسی نەخشە بۆکێشراوی سنوور دیاریکراوی پێشکەوتخوازی مرۆڤایەتی دەزانن. هەموو لێکۆڵینەوەو بۆچوون و هەڵوێستێکیان لەبەر ڕۆشنایی ئەو بیروباوەڕە دیاری دەکەن، کوردایەتی لای نەتەوەییەکان تەنها خۆشەویستییەکی کاتی و هەست و سۆزێکی دڵگەرمی و بارودۆخێکی تایبەتی نییە، یان هەواو هەوەسێک کە دوور لە واقع بێت. یان بەدەستهێنانی چەند فشەمافێکی بچووک و داوایەکی کتوپڕی کاڵ و کرچ نییە، بەڵکو کوردە نەتەوەییەکان بیروباوەڕی نەتەوەیی بە فەلسەفەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری دەزانن، چونکە هەموو بارەکانی ژیانی نەتەوەکەمان دەگریتەوە. ئەم تێگەیشتن و بۆچوونە تا پێش ساڵەکانی ١٩٥٨-١٩٥٩ لێکنەدرابووەوە، واتە بەرەو خۆڕێکخستن نەچوو بوو، لە چوارچێوەی ڕێکخستنێکی پتەوی داڕێژراوی شیاو بەو بیروباوەڕە. ئەو کۆڕو کۆمەڵە کوردییانە کە لە پێش تا دروستبوونی (لاوانی نەتەوەیی کوردو یەکێتیی قوتابیانی کورد، پارتی گەلی، کاژێک) لەسەر شانۆی سیاسی کوردستان کاریان دەکرد لەژێر فەلسەفەی کوردایەتی نەبوون. هەندێکیان هەست و سۆزێکی خۆشەویستی

کاتییان بەرامبەر بە کوردو کوردستان هەبوو و بەوجۆرە لێی تێگەیشتبوون و وایاندەزانی خۆشەویستییەکە بۆ دڵگەرمکردن و هاندانی سەردەمێکی تایبەتییە لە ڕێگەی بەدەستهێنانی چەند داواو ماف و ئامانجێکەوە، کە بە بەدەستهێنانی کۆتایی بە کوردایەتی و بیروباوەڕەکە دێت و دەپووکێتەوە. لە مێژووی نزیکی ئەم کۆڕو کۆمەڵ و پارتە سیاسییانەدا (پارتی دیموکراتی کوردستان) لە سەرووی هەموویانەوەیە، چونکە بەوجۆرە دەناسرا لەناو کوردا کە حزبێکی نەتەوەییەو هەڵگری بیروباوەڕی کوردایەتییە، ئەویش لەبەرئەوەی هەندێک لەو ئامانج و داوایانەی کە دیاریکردبوو، لە مافە نەتەوەییەکان بوون. لەلایەکی ترەوە پارتی دروست بوو لە پاشماوەی ئەو گرووپ و کۆمەڵە کوردییانەی کە داواکاری مافەکانی کوردبوون. واتە وا نیشانە کرابوون کە سەرکردەو کەسانی ناو ئەو گرووپ و کۆمەڵانەی کە لەژێر کاریگەری ڕێڕەوێکی نەتەوەییدا بوون.

سەرەڕای ئەوەی بوونی بارزانی لە سەرۆکایەتیی پارتیدا بەهۆی مێژووی دیارو ئاشکرای لە شۆڕش و کاری نیشتماندا، بەرەنگاربوونەوەی دژی داگیرکەرانی کوردستان و سەردانەنەواندنی بۆیان ببووە هۆی ئەوەی ئەو پارتە بە پارتێکی نەتەوەیی بزانن لە ڕووکەش و دیوی دەرەوەیدا، بەڵام لە ناوەڕۆک و واقیعدا ئەو حزبە خاوەن بیروباوەڕی نەتەوەیی، واتە (کوردایەتی) نەبوو، چونکە ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی بڕوای نەتەوەیی بێت، دەبێت هێزو توانای بۆ ڕزگاری و سەرفرازی نەتەوە داگیرکراوەکە بێت، یان بۆ بووژاندنەوەی گیانی بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەرو دوژمن بێت

لەپێناو سەربەخۆیی یەکگرتنەوەی کوردو کوردستاندا. نەک وەکو لە پڕۆگرام و پەیڕەوی ناوەوەی پارتیدا نووسراوە (خەبات دەکەین بۆ پاراستنی یەکێتیی نیشتمانیی عێراق و پتەوکردنی برایەتی کوردو عەرەب و خەباتی هاوبەشییان).

واتە مانەوەی کورد بە ژێردەستی و مانەوەی کوردستان بە بەشێک لە نیشتمانی داگیرکەر، پاش ئەوەی کوردپەروەران لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی، تێگەیشتن لە واقیعەکەو بۆیان ڕوونبووەوە، لەبەر ڕۆشنایی ئەزموونەکانی نەتەوەی کوردو کوردستان خۆیداو تەجروبەکانی نەتەوەکانی دنیا، تاکە بیروباوەڕو ڕێگای سەربەخۆیی و بەدەستهێنانی ژیانێکی کامەران و بەختەوەر بریتییە لە یەکگرتنەوەی نیشتمانە دابەشکراوەکەی کوردستان. ئەویش لە ڕێگەی بیروباوەڕی نەتەوەییە، کە بەڵگە ڕوون ئاشکراکانی سەربەخۆیی نەتەوەکان و یەکگرتنەوەی چەندەها پارچەی نیشتمانی ئەو نەتەوانەو دامەزراندنی ڕژێمە سوشیالیست و یەکسانەکان باشترین نموونەی ئەو ڕاستییانەن.

ئەم کوردە نەتەوەییانە بۆیان ڕوونبووەوە، کە تەنها بیروباوەڕێک چارەسەری دەردەکانی کوردو کوردستان بکات لە هەموو ڕوویەکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕی نەتەوەییە لەژێر فەلسەفەی (کوردایەتی)یدا. تەنها بیروباوەڕێک کە هاندەرو گیانی نەبەزین و ئازایەتی و ماندوو نەبوون بێت و بەهێزکردنی جوڵێنەری نەتەوەکەمان بێت لە ڕێگەی پاراستنی قەوارەی نەتەوەییماندا، تەنها بیروباوەڕی نەتەوەییە. لەبەر ئەو ڕاستییانەی باسمان کرد ئەو کوردە خاوەن بڕوایانە کەوتنە خۆکۆکردنەوەو خەبات و

کارکردن لە ڕێگەی دروستکردن و پێگەیاندن و هۆشیارکردنەوەی خەڵکی کوردستان و گەنجانی کورد لە ڕوشنبیرو قوتابی و کاسبکارو زەحمەتکێش و جوتیارو هەموو کوردێکی تری دڵسۆزی کوردستان، وە ڕۆشنکردنەوەی بیروباوەڕی نەتەوەییمان بۆیان، لە تێگەیاندنیان کە کورد کێیە؟ کوردستان کامەیە؟ بۆچی دەبێت بڕوای نەتەوەیی سەرمەشقی ڕزگاری و سەربەخۆیی و یەکگرتنەوەی خاکی کوردستان بێ دامەزراندنی ڕژێمێکی سۆشیالیستی، کە نەتەوەی کورد لە سایەیدا کامەران و بەختەوەرو شادمان بژی. هەروەها بۆچی پێویستمان بە ڕێکخستنێکی نەتەوەیی و ڕێڕەوێکی دیارو ئاشکرا هەیە. ئەم ڕاستییانە لەپاش ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ زیاتر دەرکەوت و ڕۆشنبووەوە، چونکە بەڕاستی ئەو شۆڕشە سەنگی مەحەک بوو، مەودایەکی گرنگی دروستکرد بۆ ناساندنی ئەو پارت و کۆڕو کۆمەڵ و بیروباوەڕانەی کە تا ئەوکاتە کورد بەپێچەوانەوە لێیان تێگەیشتبوو. پاشان ئەم نەتەوەپەرستە کوردانە لە ڕیزەکانی پارتیدا، یان بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە دەرەوەی پارتیدا خەریکی بەئاگاهێنانەوەو ڕاهێنانی کوردپەروەران بوون بەو بیروباوەڕە، چونکە ئەم بیروباوەڕە لە مەبەست و ناوەڕۆکدا گرنگە، جوڵاندنەوەیەکی مێژووییە دژ بە دوژمن و هەموو جۆرە کارو تێگەیاندنێکی نانیشتمانی و نانەتەوەییە. بۆیە زۆر دوژمن هەیە لە قاڵب و جۆرێکی خەبات بەو شێوازە جموجۆڵ دەکات، تا دوژمنان و داگیرکەران نەتوانن زەرەرێکی گەورەو گران و کوشندە پێبگەیەنن .

لەلایەکی ترەوە، دەبێ کەسانێک هەڵگری ئەو بڕوایە بن کە

شیاوی ئەوەبن، چونکە هەڵگرەکانی دەبنە ئاوێنەی بیروباوەڕەکە. دەبێت زۆر بە ڕێکوپێکی و ژیرانە لە بیروباوەڕەکە تێگەیشتبن و هەزمیان کردبێت، لە جۆری خەبات و شۆڕشگێڕێتی و فەلسەفەی کوردایەتی و ڕێڕەوی سیاسی لە بنەڕەتەدا شارەزابن.

بۆ هەموو ئەم مەبەستانەی کە لەسەرەوە ئاماژەم پێدان، لە ساڵەکانی ۱۹۵۸-۱۹۵۹ بەدەوری هۆشیارکردنەوەو ڕاهێنان و دیاریکردنی کەسانێکی نەتەوەیی کە شیاوی هەڵگرتنی ئەو بڕوایە بن، هاوکات گۆشکردنیان لە هەموو ڕوویەکەوە بە فەلسەفەی کوردایەتی و بیروباوەڕی نەتەوەیی.

## چۆنێتی دروستبوونی جوڵانەوەو ڕێکخستنە نەتەوەییەکان (لاوان و قوتابیانی نەتەوەیی کورد، پارتی گەلی، کاژیک)

پاش ئەوەی کە هەستم کرد بۆشاییەکی گەورە هەیە لە باشووری کوردستاندا بەهۆی نەبوونی گرۆیەک، یان جوڵاندنەوەیەکی نەتەوەیی، بیرۆکەی دروستبوونی جوڵاندنەوەیەکی نەتەوەییم لەلا گەڵاڵە بوو. سەرەتا بڕیارمدا بۆ دروستکردنی ئەو جوڵانەوە نەتەوەییە لە چوارچێوەی پارتێکی سیاسیدا بێت، بەڵام پاشان بۆچوونەکەم گۆڕی بۆ ڕێکخراوێکی پیشەیی نەتەوەیی. لەو کاتەدا وتووێژم لەگەڵ هاوبیرو هاوڕێی ئازیزم (محەمەد هەرسین) کرد، کە ئەویش لەڕووی بیروباوەڕەوە لەیەکتری زۆر نزیکبووین، هاوکات بڕیاری دا هاوکارم بێت و ببێتە بەشێک لە جوڵانەوەکە.

پاشان ناوی جوڵاندنەوەکەمان دانا لە ساڵی ۱۹٦۱-۱۹٦۲ دروشمەکەی و تەنانەت شێوازی نووسینی بڵاوکراوەکانی و

ناوەرۆکی نووسراوەکانی من خۆم بڕیارم لەسەر دا، بەناوی (لاوانی نەتەوەیی کورد)، بەڵام لەپاش گۆڕینەوەو وتوویژ لەگەڵ خوالێخۆشبوو (محەمەد هەرسین)دا، کە ئەویش زۆر پێی باش بوو، بڕیارمان دا بە دروستکردنی ئەم ڕێکخستنە نەتەوەییەو پاشان هاتە بواری جێبەجێکردن، ئیتر لێرە بەدواوە دەستمان بە خەباتێکی نوێ کرد. سەرەتا خەبات و تێکوشانی ئەم دوو ڕێکخراوە لەبەر ڕۆشنایی بیروباوەڕی نەتەوەیی بێت. دروشمی جوڵانەوەکەش کە من دیاریم کردبوو، بریتیی بوو لەم دروشمە (کوردێکی سەربەخۆ لە کوردستانێکی یەکگرتوودا)، ئەمە دروشمی جوڵانەوەکەمان بوو. ناوەڕۆکی نووسراوەکانم بە (زمانی کوردی سابڵاخی) دەنووسی، لەبەرئەوەی گومان لە دروستکەرانی جوڵانەوەکەمان دووربخرێتەوە، تا لە سەرەتادا ئاشکرا نەبین و لەناو نەبرێین و نەگیرێین لەلایەن ڕژێمی ئەوکاتەوە.

لە سەرەتادا بەیانی ژمارە (١،٢،٣)مان دەرکرد، پاش ئەوە پێشنیارم کرد بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەیەک و بڕیارمان لێدا، کە ناوەکە لەسەر داوای من بوو، ناوبنرێت (چرای کوردستان)، چونکە پێشنیارێکی تر هەبوو لەلایەن (محەمەد هەرسین) کە ناو بنرێت (چرای کورد) پاش گۆڕینەوەی بیروبۆچوونەکان بڕیاردرا ناوەکەی ئێمە پەسەند بکرێت، واتە (چرای کوردستان) ببێتە ڕۆژنامەی فەرمی (لاوانی نەتەوەیی کورد)و لەدوای یەکگرتنەوەی کاژیک و هەردوو ڕێکخراوەکە بووە بڵاوکراوەو ڕۆژنامەی (کاژیک) بۆ ڕوونکردنەوەی فەلسەفەی کوردایەتی و ڕەیڕەوی سیاسی بیروباوەڕەکەمان بوو، ناوەڕۆکی نووسینەکانی

ئەم ڕۆژنامەیەش من دەمنووسییەوە، کاری ڕێکخستنیش من سەرپەرشتیم دەکرد، زۆربەی کات (محەمەد هەرسین) هاوکاریی دەکردم لە سەروتارەکانداو هاوکاری تایپی دەکردم.

لە هەمانکاتیشدا باری ڕێکخستن هەر خۆم سەرپەرشتیم دەکرد، لەگەڵ ڕۆژنامەکاندا، چونکە سەرەتا ژمارەمان کەم بوو، زۆر ئەرک کەوتبووە سەر خۆم، لەدوای ماوەیەک پاش کۆکردنەوەو هاتنە ڕیزی کەسانی تینوو بە هەستی نەتەوەیی بۆ ناو جوڵانەوەکەمان، فراوانتر بوو. پاشان بڕیاری دروستکردنی (یەکێتیی قوتابیانی نەتەوەیی کورد)مان دا لە ساڵی ١٩٦٢ دروشمێکمان بۆ دیاری کرد، کە بریتیی بوو (لە خوێندەوارییەکی کوردی و پەروەردەیەکی نەتەوەیی)، ڕۆژنامەیەکمان بۆ دیاریکرد بە ناوی (ڕابەر)ەوە، ئەرکی نووسینەکانی و تایپکردنی ڕۆژنامەکەش کەوتە سەر بەندە، بەهەمان شێوازی (چرای کورستان).

سەرەتا بە دەستووخەت دەمانووسی تا پەیداکردنی تایپ بۆ هەردوو ڕۆژنامەکەو شوێنی دەرکردنی هەردوو ڕۆژنامەکەو تایپکردنیشی لە ماڵی خۆمان بوو لە گەڕەکی (سەرشەقام)، واتە ماڵی (نوری بەگی عەبدولڕەحمان بەگی بابان)، پاشان دێینە سەر باسی هاوبیرانی تریش کە پەیوەندییان کرد بە جوڵانەکەوەو ڕۆڵ و بەشدارییان لە نووسینی وتارەکان لە هەردوو ڕۆژنامەکەدا.

سەرەتا ئەم دوو ڕۆژنامەیە (چرای کوردستان، ڕابەر) مانگانە بە ڕێکوپێکی و لەکاتی خۆیدا دەردەچوو، تەنها ژمارەیەکی نەبێت کە بەندە دەستگیرکرابووم لەپاش شەڕکردنەوەی بەعسییەکان لە حوزەیرانی ١٩٦٣دا، لە شوێنی من هاوبیرێکی ترمان کە قوتابی

بوو بە ناوی (ع.م) هەستابوو بە دەرکردنی ئەو ژمارەیە بە هاوکاری (محەمەد هەرسین). لە جۆری نووسین و شێوازی نووسینی ئەو ڕۆژنامەو نووسراوانە بەشێوەی دیالێکتی کوردی کوردستان-ڕۆژهەڵات دەمانووسی وەکو لەسەرەوە ئاماژەم پێدا، بەتایبەتی (چرای کوردستان) بەکارهێنانی ئەم شێوازە وەکو وتمان بۆ دوورخستنەوەی شک و گومان بوو لەسەر خۆمان، لەلایەکی ترەوە جۆری نووسینەکان زۆر ئاشکراو دیاربوون بەئاسانی لە ناوڕۆکەکەی دەگەیشتی و گوزارشتی لە هەست و سۆزی هەموو کوردێک دەکرد، بۆیە بە تامەزرۆو تاسەوە دەکەوتە دەست ئەندامان. هەندێجار خەڵکی نەتەوەیی کە جێگای متمانەمان بوون هەر نووسراوێک دەکەوتە دەست (٤-٥) کەس و دەیانخوێندەوە، هەردوو ڕۆژنامەکە ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو بۆ هۆشیاری نەتەوەیی ئەندامان و ئەوکاتەی خەڵک.

پێویستە لێرەدا باسی ڕۆڵی ئەو هاوکارو هاوبیرانە بکەین کە لەدوای دامەزراندن پەیوەندییان کرد بە جوڵاندنەوەی (لاوان و قوتابیانی نەتەوەیی)، سەرەتا وەکو دەستەی دامەزراندن (تۆفیق نوری بەگ، محەمەد هەرسین) بوو. پاشان پەیوەندیمان کرد بە چەند هاوبیرێکی تری نەتەوەییەوە یەکێک لەوانە (عەبدوڵڵا عەزیز) کە ناسرابوو بە (ئاگرین)، ئەویش ئامادەیی دەربڕی بۆ کارکردن و هاتە دەستەکەوە، دواتر پەیوەندیمان کرد بە کۆمەڵێک کوردپەروەری تر کە نزیک و هاوڕێ و دۆستمان بوو. هاوشێوەی ئێمە بیریان دەکردەوە. یەکەم هەیکەلی ڕێکخستنمان بریتی بوون لەمانە (عەبدوڵڵا ئەحمەد، ئا.ج، ل.ص، ئەن، مەلا فەتاح). هەیکەلی

کاسبکارانمان (عوسمان حەمەسالح، م ف، کەمال، تاهیر. م ، ع.ع).
بەتایبەتی ئەوانەی لە بڵاوکراوەکاندا دەیاننووسی، بریتیبوون لەمانە: (محەمەد هەرسین، تۆفیق نوری بەگ، عەبدوڵڵا ئاگرین، لەتیف قەرەداغی، فەتاح عەبدولڕەزاق).

هاوکات لەلایەکی ترەوە، کۆمەڵی کوردپەروەرو ڕۆشنبیری نەتەوەیی تر هەستابوون بە دامەزراندنی (کۆمەڵەی ئازادی و ژیانەوەی یەکێتیی کورد) (کاژیک) پێش ئەو سەردەمەی ئێمە کە جوڵاندنەوەکەمان دروستکردبوو. ئەوان بە یەک دوو ساڵ دامەزرابوون، ئەوان لە ساڵەکانی ١٩٥٩ بۆ ١٩٦٠ دامەزرابوون، کە دەستەکەیان بریتیبوون لەم هاوبیرانە: (عەبدوڵڵا جەوهەر، فەرەیدون عەلی ئەمین، ئەحمەد حەسەن بەگ (ئەحمەد هەردی)، پارێزەر کامل ژیر، د.جەمال نەبەز، فایەق عارف، د. ئیحسان...)و چەند ڕوشنبیرێکی تریش هاوکاریان بوو.

پاشان بە چەند جار بینینی من و هەردی شاعیر بۆ ئاشکرابوونی کاری ڕێکخراوەکەی ئێمە و هاوبیرانی (کاژیک) لێرەوە بوو بە خاڵی دەستپێکی ئاشکرابوون، چونکە پێشتر نە ئێمە زانیبوومان کە ڕێکخراوێک هەیە وەکو ڕێکخراوەکەی ئێمە بیر دەکەنەوە بە ناوی (کاژیک)، نە ئەوان بە جوڵاندنەوەکانی ئێمەیان زانیبوو. هەر لەو ڕوانگەیەشەوە پاش چەندجار وتووێژکردن لەنێوان من و هەردیداو جارێکیش لەنێوان (هەردی، بەندە، محەمەد هەرسین) کەوتینە ئەو ڕاستییەی کە دەبێت ڕێکخستنە نەتەوەییەکان یەکخەین و لە بۆتەیەکی پتەو بەهێزدا خەبات بکەن. هەر لەدوای ئەو دانیشتنانە (محەمەد هەرسین) پەیوەندی بە (محەمەد عەزیز) کردبوو بۆ

وەرگرتنی بۆچوونی سەبارەت بەو بابەتە کە پێشتر منی ئاگادار کردووە لەو پەیوەندییە، نێوانیان لەدوای ئەو پەیوەندییە (محەمەد عەزیز) لە ئێمە نزیک بووە، ئەویش ئامادەی کارکردنی دەربڕی، هاوکات لە هاوبیرانی دەستەی هەردوو ڕێکخراوەکە بڕیاری دروستکردنی دەزگایەکی تری سیاسیمان دا بەناوی (پارتی گەلی شۆڕشگێڕانی کوردستان). جگە لە بەندەو هەرسین و محەمەد عەزیز کە بەشداربووین، هەرچەندە هێزو بنکەی فراوانی ئەم دەزگایە خۆی نەبوو تا ئەندازەیەک لاوازبوو، زۆربەی چالاکییەکانی و جموجۆڵەکان هاوبیرانی (لاوانی نەتەوەی و قوتابیان) دەیانکرد. ئەوانیش هەموو هێزێکیان بریتیبوو لە هاوبیرانی ئێمە لەکاتی چالاکییاندا. پاشان بڕیاری یەکگرتنمان دا لەگەڵ (کاژیک)، بەمەرجێک ناوی (لاوانی نەتەوەیی و قوتابیان نەتەوەیی) وەکو خۆی بمێنێتەوە لەناو (کاژیک)دا، بەڵام دەزگا سیاسییەکە کە ناوی (پارتی گەلی) بوو نەما، تەنها ناوی (کاژیک) مایەوە. من کرامە بەرپرسی (ل. پەیوەندییەکان) نێوان سەرکردایەتی و لقەکان خوارەوە (هەرسین و محەمەد عەزیز) خرانە ناو سەرکردایەتی (کاژیک)، هەرچەندە (محەمەد عەزیز). ڕۆڵێکی زۆری نەبوو لە ڕێکخستنی نەتەوەییدا بۆ پتەوکردنیان و بەهێزکردنی جوڵانەوەکە، وەکو دەرکەوت تەنها مەبەستی خۆبردنە پێشەوەو پلەوپایەو دەستکەوتی تایبەتی بوو لەسەر شانی نەتەوەییەکان.

ڕۆڵی گرنگ (لاوان و قوتابیانی نەتەوەیی) دەیانگێڕا، چونکە لە کوردپەروەرە نەتەوەییەکان و خوێنگەرم و قوتابییە چالاک و نەبەزو شۆڕشگێڕەکان دروست ببوو. لەڕاستیدا لەدوای یەکگرتنی

ئێمە لەگەڵ (کاژیک)، کۆمەڵێ کێشەو ململانێی نوێ دروستبوو. جەوهەری کێشەکانیش دامەزرێنەرەکانی (کاژیک) بوون، چونکە لە کەسانی بەساڵاچوو و کەم جموجۆڵ و سست و ناچالاک بوون. لە زۆر کات و باردۆخدا ئەو جموجۆڵ و کارانەی ئێمە لە (لاوان و قوتابیانی نەتەوەیی) دەمانکرد، لایان پەسەند نەبوو. ئەوان دەیانویست جوڵانەوەکە بە خامۆشی بڕوات، یان (لە کولەکەدا بانگ بدرێ). ئەمجۆرە خەباتەش هی سەرەتای دروستبوونی بڕوای بڵاوبوونەوەی ئیسلامی بوو، نەک ئێمە، لە ساڵەکانی ١٩٦١ بەدواوە دەژیان، کە شۆڕش و خەباتی چەکدارانەی کورد دەستی پێکردبوو. تەنانەت پارتی کە حزبێکی بێ بڕوای ناوەڕاستڕەو بوو، گیانێکی شۆڕشگێری بە بەرخۆیدا کردبووەوە. گۆشکردنی ئەو سەرکردانەی (کاژیک) تەنها (نظری) بوون و دووربوون لە خەباتی واقیع و نەتەوەیی شۆڕشگێڕییەوە.

ئەمانە خەباتی سەردەمی ١٩٤٦-١٩٤٧-١٩٤٨یان بە بارودۆخی خەباتی ساڵەکانی١٩٦٠-١٩٦١ بەدواوە بەراورد دەکرد، ئەوەبوو ئەوانە بە کردار تەنانەت هەڵوێستێکی دیارو ئاشکرایان نەبوو بۆ هاتنە کۆڕی خەبات و تێکۆشان و نزیکبوونەوە لە بیروباوەڕو ڕێڕەوی سیاسییەکانی تری کوردستان. سەرەڕای ئەوەی لێزان و شارەزای مەسەلەی ڕێکخستن و جموجۆڵی ڕێکخستن و نەخشەو خەبات سیاسی نەبوون، زیاتر لە بوارەکان ئەدەبی نووسین شارەزاییان هەبوو. ئەم کێشانە بەوشێوەیە بەردەوام بوون تا کار گەیشتە ئەوەی بەیانێک دەربکرێت، بە تەجمیدکردنی بەشێک لە سەرکردایەتی (کاژیک)، هەرچەندە من لەگەڵ ناوەڕۆکی بەیانەکە

نەبووم، بەڵام من وام بڕیاردا باڵی خۆمان کە هاوبیرانی (پارتی گەلی و لاوان و قوتابیانی نەتەوەیی) لە چالاکی دروستکردنی پەیوەندییەکان ڕانەوستین و ئێمە خۆمان پابەند نەکەین بەو کێشانەی کە دروستبوو.

سەرەتا من بیرم لەوە کردەوە لە ڕێگای (ئەحمەد تۆفیق)و برادەرانی حزبی دیموکراتی کوردستان ڕۆژهەڵات، کە پەیوەندییەکی زۆر تایبەت و بەهێزم لەگەڵیاندا هەبوو لەڕێگەی (ئەحمەد تۆفیق) لە بارزانی نزیکبینەوە، من سەردانم کرد. لەو سەردانەدا داوامان لە (ئەحمەد تۆفیق) کرد پشتگیری ئەوەمان بکات و داوا لە بارزانی بکات یەکێک لە ئێمە بچێتە سەرکردایەتیی پارتی، سەرەتا هاوبیرانم بەتایبەتی (ئەحمەد تۆفیق) داوایان لە من کرد بۆ ئەو پۆستە، چونکە برادەرانی حیزبی دیموکرات پێیان وابوو کە بەندە نزیکترم لە بارەگای بارزانی و بەتایبەتی کاک ئیدریس پێشنیازیان کرد، بەڵام بەهۆی تەمەن و زۆر نزیکیم لە (محەمەد هەرسین) من پێشنیارەکەم گۆڕی بۆ (هەرسین)، کە بخرێتە لیژنەی مەرکەزی و (محەمەد عزیز) بچێتە بارەگای بارزانی، ئەم بابەتە هیچ پەیوەندی بە (کاژیک) نەبوو، زیاتر هەوڵی (ئەحمەد تۆفیق) بوو، کە پێشتر پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری پێدابووین، ئەوەبوو هەردوو داواکارییەکەی بۆ جێبەجێ کردین.

بێینەوە سەر کارو چالاکییەکانی لاوان و قوتابیانی نەتەوەیی من داوام لە (کەمال عوسمان دایی) کرد کە نەخشەیەکی چاپمان بەوێنە بۆ دروست بکات، کە ڕەنگدانەوەی دروشمەکانمان بێت، ئەو دروشمانە زۆرمان لێ بڵاوکردەوە لەڕێگای هاوبیرانمانەوە، بەتایبەتی (فەتاح

عەبدولڕەزاق، ئەنوەر برزو، عەلی سام ئاغا) ڕۆڵێکی زۆر باشیان گێڕا بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو دروشمانە، وێنە چاپکراوەکە بەم شێوەیە بوو، ڕیزە شاخێک و ڕۆژی لێوە هەڵاتبوو. پەڕاوێک و پێنووسێک و شووشە مەرەکەبێک لەگەڵ چوار خەتی ڕاست و چەپ)، کە نیشانەی چوار پارچەکەی کوردستان بوو.

پاشان هەوڵمدا هەیکەلێکی نوێی ڕێکخستن لە کوردستانی ڕۆژهەڵات دروست بکەم لەم کوردانە (ئیبراهیمی سەردەشت نازناوەکەی هورمز) بوو، کە هاتە سلێمانی و وتارێکی لە ڕۆژنامەی (ڕابەر)دا بڵاوکردەوە، کەسێکی زۆر چالاک بوو، قوتابی فەقێ بوو پاشان (حەسەن دارتاش) خەڵکی دەوروبەری بانە بوو، (ئەحمەد سابڵاغی) کرێکار بوو، چەند ئەندامی ترمان لە ڕێگەی ئەو هاوبیرانەوە ڕێکخست.

پاشان لەدوای دروستکردنی ئەم هەیکەلە ڕێکخستنەی کوردستانی ڕۆژهەڵات و فراوانبوونیان، چەند جارێک سەردانم کردن و لەگەڵیاندا کۆبوومەوە، بەڵام لە دوا کۆبوونەوەدا بڕیاردرا بە دروستکردنی گرۆپەکی نەتەوەیی بۆیان بەناوی (کۆمەڵەی ڕزگاری) لەڕێگەی ئێمەوە توانیمان پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ سەرکردەکانی (حزبی دیموکراتی کوردستان-ڕۆژهەڵات) بۆ دروست بکەین. یارمەتی یەکتریان زۆر دەدا لە نموونەی ئەو سەرکردانەش (ئەحمەد تۆفیق، واتە عەبدوڵڵا ئیسحاقی سکرتێر)، پاشان (مەلا جەمیل) (ئەوڕەحمانی سەقزی، عومەر نەگلی، فائق مەلا سەعید ڕەشید، قادر شەریف، محەمەد، کوڕەکانی ئاغازادەی بۆکانی). ئەمە سەرەتایەکی کورت بوو بۆ ناساندنی هەویەی نەتەوەییەکان و کورتەیەکی دروستبوونیان.

## ڕۆڵ و هەڵوێستی نەتەوەییەکان لە شۆڕشی ئەیلوولدا

مەبەستی نەتەوەییەکان دیارو ئاشکرابوو لە گەرمکردنی خەباتی نەتەوەیی و شۆڕشگێڕیی دژ بە داگیرکەران، ئەویش لە ڕێگەی بەدەستهێنانی ئامانج و ئاواتەکانی نەتەوەی کورد، کە سەرەکییەکانی بریتییە لە (سەربەخۆیی کوردو یەکگرتنەوەی خاکی کوردستان و دامەزراندنی ڕژێمێکی سۆشیالیستی). لەبەرئەوە دروستکردنی شۆڕشێکی نەتەوەیی لەناو کوردا دژ بە داگیرکەرو خاوەن ڕێڕەوێکی شۆڕشگێڕانەی دیارو ئاشکراو مەبەست و ماف و ئامانجی ڕوون لە ئامانجە هەرە سەرەکییەکانی نەتەوەییەکان بوو.

شۆڕش دروستکردن لەناو نەتەوەدا، دیارە نەتەوەییەکان ڕۆڵیان ئەوە دەبێت کە بەهێزو پتەوی بکەن و هەوڵی کۆکردنەوەی کورد دەبێت لە دەوری شۆڕشەکە بۆ سەرکەوتن و بەدەستهێنانی مافەکانی. پاشان ئەو شۆڕشانەی نەتەوەییەکان خۆیان پێی هەڵسن، یان کۆڕو کۆمەڵێکی تری سەر بە بەرەی کوردایەتی پێی هەستابێت، چونکە بەلای نەتەوەییەکانەوە ئەو ڕاستییە سەلمێنراوە کە کوردستان لە هەموو کورد داگیرکراوە، لەبەرئەوە پێویستی بە تواناو لێهاتنی هەموو کوردە. بۆ ئازادی و یەکگرتنەوەی بە دروستبوونی شۆڕشی ئەیلوول لە نەتەوەییەکان بەگوێرەی تواناو بارودۆخی خەباتیان هاوکارییەکی گرنگیان کرد لە دروستکردنی و گەشەکردنیدا، جا چ لە سۆران، یان بادینان، چ بەهۆی چوونە ڕیزی شۆڕشەوە، ڕاستەخۆ لەگەڵ دەزگاکانی سەرکردایەتیی شۆڕشدا، یان لە ڕیزەکانی پارتیداو پێشمەرگەدا، یان بە یارمەتیدانی شۆڕش

بە پێویستییەکان وەکو هەموو کوردێکی تری دڵسۆزی شۆڕش.

بەهێزکردنی شۆڕش و یەک پارچەیی وەستانی کورد دژی داگیرکەرانی کوردستان و پتەوکردنی بەرەی کوردایەتی و لە مەبەستەکان و ئامانجەکانی نەتەوەییەکاندا بوو. نەتەوەییەکان لەبەرئەوەی خەباتێکی گشتی دەکەن، بیریان لە دەستکەوتی تایبەتی (حزبی) نەدەکردەوە. تەنیا مەبەست لایان سەرکەوتنی شۆڕشی کوردو بەدەستهێنانی ئامانجەکانی بوو، بۆیە دروشمی ئەوکاتەی نەتەوەییەکان بریتی بوو لە (پاراستنی قەوارەی نەتەوەیی، کوێر نەبوونەوەی ناوی کوردستان و بەدەستهێنانی حوکمێکی زاتی فراوان).

لای نەتەوەییەکان زۆر ئاسایی بوو لەژێر سایەی پارتی و بارزانیدا درێژە بە خەبات بدەن، سەرەڕای دوژمنایەتیکردنی جارجارەی لێپرسراوانی پارتی و سەرکردەکانیان دژی نەتەوەییەکان و بەنیازی دوورخستنەوەیان بوون، چونکە دەیانزانی ئەم نەتەوەییانە لەوان کارامەو شارەزاو ژیر لێهاتووتر بوون، دوور لە بەرژەوەندی و سودی تایبەتی، دوای شۆڕش کەوتوون و خەباتی بۆ دەکەن، بێ چاوەڕوانکردنی پاداشت و ئافەرین و پلەوپایە بە نان و جلوبەرگی خۆیانەوە. هەر کارێکیان پێ دەسپێردرابێت، هەرچەندە گران و قورس بووبێت، بەسەرکەوتووانە بەئەنجامیان دەگەیاند، لەکاتێکدا ئەو کارو چالاکییانە لەلایەن ئەو لێپرسراو و سەرکردانەی خودی خۆیان بۆیان جێبەجێ نەدەکرا.

ئەم لێپرسراو و سەرکردە هیچ لەبارانەبووانە لە سەرەتای دروستبوونی ڕێکخستنە نەتەوەییەکانەوە بە (کورد کوژە) جماعەتی

(انفصالەکان) (دوژمنانی عەرەب) جۆرەها ناووناتۆرەی دیکە ناویان دەبردن. تەنانەت نانیشتمانی ئەم لێپرسراو و سەرکردانە گەیشتبووە ڕادەیەک (کوردیان بێهیوا دەکرد) بە پشت ساردکردنەوە لە خەبات، بەوەی کە دەیانوت (ئێمە خانووە قوڕەکانمان بۆ ڕزگار ناکرێت، کەچی کاژیکەکان داوای ڕزگاری چوارپارچەکە دەکەن).

ئەم بوودەڵەو هیچ لەبارانەبووانە لێپرسراوانی پارتی و شۆڕش بوون، خۆیان لەو ڕاستییە گێل دەکرد کە نەتەوەییەکان زۆر قوڵترو فراوانتر لە مەسەلەی کوردو کوردستان گەیشتبوون، هەروەها لێکدانەوەو لێکوڵینەوەو دیاریکردنی پلەی خەبات و کردەوەی شۆڕشگێرییان لەبەر ڕۆشنایی بڕواکەیانەوە دەکرد، هاوکات زیاتریش لە جوڵانەوەی کوردایەتی تێگەیشتن لە تواناو هێزی نەتەوەکەمان و بارودۆخی خۆڕاگرتن، هەروەها هەڵسەنگاندنی سیاسەتی نێودەوڵەتان و ئاڵۆگۆڕو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی نێوانیان و سروشت و چۆنییەتی داگیرکەرەکانی کوردستان و جۆری بیرکردنەوەیان و کارو کردەوەی دوژمنایەتیکردنیان و بێ ڕەوشتییان بەرامبەر کورد.

پاشان نەتەوەییەکان بەمجۆرە نەخشەو پلان و دروشمەکانیان دیاریی بکەن بۆ مسۆگەری سەرکەوتن و بەدەستهێنانی مافی کورد، ئایا لە ئاستی ئەو بوودەڵەو بەرژەوەندپەرستانەدان کە هەڵوێستیان تەنها بۆ خۆقەڵەوکردن بوو لەسەر شانی میللەت و خوێن و ماندوویێتی خەڵکی کوردستان، ئەم بەناو کوردانە کە بە بچووکترین ڕەخنەلێگرتن و لێپرسینەوە دەکەوتنە ئەمبەرو ئەوبەرکردن، یان گەرمیان و کوێستان بۆ سودی گیرفان و

بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان. نەتەوەییەکان بێ چاوەڕێ پاداشت و دەستکەوتی تایبەتی، بە نانەسکی چاوەڕێی گیانبەخشین بوون، هەرچەند دژایەتی بکرێن و ڕێگەی لێپرسراویتییان لێ بگیرێت، تەنانەت هەوڵی دوورخستنەوەیان بدرێت بەگوێرەی پلەی خەباتیان. پڕوپاگەندە دژی نەتەوەییەکان بکرێت، کە گوایە دژی عەرەبن، ئایا لەو ڕاستییە کەم دەکاتەوە کە دوو پارچەی کوردستان لەژێر دەستی عەرەبدایەو هێزەکانی داگیرکەر کە بۆ کوشتنی کورد دێنە کوردستان، عەرەبن و کوردستان کاول و وێران دەکەن.

ئەو ئەفسەرو سەربازانەی بە دڕندەترین شێوە کورد لەناودەبەن و ولاتەکەی پێ چۆڵ دەکەن، ئایا عەرەبن، یان نا؟ ئەگەر عەرەبێک ڕێگای ئازادی و سەربەخۆیی و یەکگرتنەوەی خاکی کوردستان بگرێت لە کوردو کوردیش بە عەرەب بزانێت و کوردستان بە بەشێک لە نیشتمانی عەرەب، ئایا دەبێت بە دۆست و پارێزەری کوردو بەچاوی ڕێزەوە سەیر بکرێن؟ پاشان جولانەوەی نەتەوەیی لەبەرئەوەی ڕووبەندی بەناو نیشتمانپەروەران و دەرخەری ڕووی ڕاستی دۆست و دوژمنانە، شکی تێدا نییە کە دووژمنایەتییەکی زۆر دەکرێت و ڕێی کاریگەری پێشکەوتن و سەرکەوتن و بەهێزبوونیان لێدەگیرێت.

دەبێت چ کوردێک لە نەتەوەیەک ڕاستترو بەڕەوشتتر بێت و بەئاشکراو بێ پێچوپەنا ڕێڕەوی بیروباوەڕی خۆی بەرامبەر دۆست و دوژمن دیاری بکات، مەبەستی لە خەباتکردنی (فلان بە وەزیر)و فلان بە کاربەدەست و فیسار بە (مدیر عام) نەبێت.

ئەم ڕێگا ونکەرانەی ڕێڕەوی ڕاستی کوردایەتی، لە پڕوپاگاندەو

کردەوەی نابەجێ بۆ سووککردنی نەتەوەییەکان دەبینییەوە، هەروەها کردنیان بە دووژمنی ئەو پارت و بیروباوەڕە سیاسییە جۆربەجۆرانەی تری کوردستان، کە تەنانەت هەستان بە دروستکردنی کارەساتی (شیوعی) کوشتن و تاوانبارکردنی نەتەوەییەکان پێی...

ئەو کارەساتانەش زۆر ئاشکراو دیاربوون کە چۆن بووە. نەتەوەییەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بە دڵساردیی لەگەڵ شۆڕشدا نەبوون، چونکە دەیانزانی ڕێگای خەبات و شۆڕش مانای بەرگەگرتن و خۆڕاگرییە. تەنها ترووسکایی مانەوەی شۆڕشیان مەبەست بوو، ئومێدو هیوایان خەڵکە ڕەشوڕووت و گیانفیداکانی پێشمەرگەی کوردستان بوو، کە بە هەستێکی پاک و بێگەردەوە لە کۆڕی خەباتدا بوون.

لێرەدا دەکرێت ئەو پرسیارە بکەین و بڵێین کە ئەمە سروشتی پارتی و ئەو لێپرسراوانە بوو، بۆچی نەتەوەییەکان هاوکارییان دەکردن و گوێی خۆیان کپ دەکرد لەو کردەوانە؟ تەنانەت زیندووکردنەوەی پارتی و دامودەزگاکانی لە ساڵی ١٩٦٤داو بەهێزکردنەوەی پێشمەرگەو ڕێکخستنەکانی سلێمانی بەهۆی ڕۆڵی نەتەوەییەکانەوە بوو لەناو پارتیدا، بەتایبەتی دوای دووبەرەکییەکە.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەمە پرسیارێکی ڕەوایەو بەجێیە، پێویستی بە وەڵامێکی ڕاست و واقیعیش هەیە کە بیسەلمێنێت بۆچی لەو ماوە دووورودرێژەی شۆڕشدا نەتەوەییەکان ئەو یارمەتی و هەڵوێستەیان هەبوو بەرامبەر پارتی و شۆڕش و خودی بارزانیش؟ ئایا خەریکی بەهێزکردن و پتەوکردنی ڕیزەکانی خۆیان بوونایە لەناو پارتیدا

باشتر نەبوو؟ یان پرسیارێکی تر وەک (شیوعی) تەنها بێدەنگ و تەماشاکەر بوونایە بۆ هاوکاریکردنی پارتی و بارزانی، بەتایبەتی لەکاتی دووبەرەکییەکەدا باشتر نەبوو؟

**بۆ وەلامی هەموو ئەم پرسیارە واقیعییانە ئەمە دەلێم:**

کاتی دروستبوونی شۆرشی ئەیلوول لە ١٩٦١دا ڕێکخستنە نەتەوەییەکان لە سەرەتای دروستبووندا بوون، بەتایبەتی (لاوان و قوتابیانی نەتەوەیی و پارتی گەلی) ئەو ڕێکخراوانە تەرخان کرابوون بۆ هۆشیارکردنەوەو پێگەیاندن و تێگەیاندن و ڕاهێنانی گەنجانی کورد بە بیروباوەڕی کوردایەتی. بەپێچەوانە تێگەیەندرا بوون بۆ مەبەستی دوورخستنەوەیان لە ڕێڕەوی ڕاستی بیروباوەڕی کوردایەتی. تەنانەت زۆربەی زۆری کورد نەیدەزانی کورد کێیە، کوردستان کامەیە؟ تەنها بەشە سیاسی و ڕۆشنبیرەکانی نەبێت لەو سەردەمەدا، ئەویش بەشێوەیەکی کەموکورتی و ئەو پارتە سیاسییانەی لەسەر شانۆی خەبات بوون (پارتی و شیوعی) بوون، هەموویان دژی بیروڕای نەتەوەیی بوون.

ئەمانە وەکو حزبێکی عیراقی، نەک کوردستانی، دەجولانەوە، مافەکانی کوردیان دیاری دەکرد، کە گەورەترینیان چەند فشەمافێکی زانیاری و ڕۆشنبیری و خوێندەواری بوون، هەتا تەنانەت ئەو حزبانە داگیرکەر بە چاوێکی خراپەوە سەیری ئەو فشەمافانەی پارتی دیموکراتی کوردستانیان دەکرد. لەلایەکی ترەوە هەولی بەستنەوەی کورد بە خەباتی داگیرکەرەوە لەژێر جۆرەها ناوی بریقەدارو جۆربەجۆر دەدا. وەکو یەکێتیی بەرژەوەندی عەرەب و کوردو یەکێتیی نیشتمانیی خەباتی هاوبەشی و یەکێتیی ئایین... هتد.

هەروەها کۆبوونەوەکانی ڕیزەکانی پارتی زۆربەی زۆری لە کەسانی سەر بە ئەندامانی ئێمە بوون لە (کاژیک)دا، واتە سەر بە بەرەی کوردایەتی پێکهاتبوون زۆربەی ئەندام و لایەنگرانیان هەست و سۆزێکی دڵسۆزانەیان هەبوو (خام) بوون، زۆرتر ڕادەهێنران بە بڕوای نەتەوەیی. هاوکات بوونی بارزانی لە سەرکردایەتی ئەو حزبەدا وەکو سەرکردەیەکی نەتەوەیی کوردو بەرزکردنەوەی چەند دروشمێکی نەتەوەیی لەلایەن پارتییەوە، بووە هۆکاری دروستکردنی بارودۆخێک کە پارتی بەو چاوە سەیربکرێت کە نەتەوەپەرستە.

کەواتە ناوی ئەم پارتە باشترین جێگایە کە مەودای تێدا فراوان بێت بۆ گەشەکردن و باسکردنی فەلسەفەی کوردایەتی و شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی ڕێڕەوی سیاسی و نەتەوەیی. مەودای دیاریکردنی ماف و مەبەست و داوای کورد ئاسان بوو بۆ باسکردنی لە ڕیزەکانی ناو پارتیدا، چونکە کۆبوونەوەکانی ناو ڕیزەکانی پارتی تینووی ئەو بیروباوەڕە بوون کە باسی ڕزگاری کوردو کوردستان و یەکگرتنەوەی بکرایە. لەلایەکی تریشەوە کە یارمەتی پارتی دەدرا بۆ درێژەدان بە خەبات و پشتگرتنی لە شۆڕش و زیندووکردنەوەی مەبەستی ڕێگە نەدان بەو بیروباوەڕە نا نیشتمانی و نەتەوەییانەی لە پەرێزدا بوون بۆ دەستگرتن بەسەر دامودەزگانی پارتی و شۆڕش و دوورخستنەوەی شۆڕش و سەرۆکەکەی لە ڕێڕەوی سیاسی کوردایەتی و هەوڵدان بۆ پووکانەوەو پۆچەڵکردنەوەی شۆڕش.

پارتی قوتابخانەیەکی کراوە بوو، جۆرەها بیروڕاو ڕێڕەوی سیاسی تایبەتی تێدا بوو، وەکو لە ساڵی ١٩٥٩دا (مارکسییەکان)

بەسەر پارتییاندا هێنا تا ناکۆکییەکەی ساڵی ١٩٦٤، کە بووە هۆی دوورخستنەوەیان لە بڕیارو فەرمان و نەخشەو دەسەڵات، تا پووکاندنەوەی شۆڕشی ئەیلوول بەئاشکراو بەزەقی دیار بوون.

هەروەها پارتی حزبی چینێکی دیاریکراو، یان دەستەوتاقمێکی تایبەتی و کۆمەڵایەتی ئابووری نەبوو، بەڵکو هەموو چین و بەرەو دەستەیەکی تێدا کۆدەبوونەوە، لەبەرئەوە زۆر ئاسانتر بوو بۆ نەتەوەییەکان کە خۆیانی تێدا ڕێکبخەن. یەکخستنی بیروڕاو ڕێرەوی ئەو خەڵکەی لەبەر ڕۆشنایی بیروباوەڕی نەتەوەیی، چونکە لە ناوەڕۆکدا جوڵانەوەیەکی گشتی سەرجەم کۆڕو کۆمەڵە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بوو بەهەموو چین و توێژاڵەکانی میللەتی کورد. هاوشان پارتی دامەزراوەیەکی سیاسی کۆن و ڕابردووی کوردەو دروستبووی لە بەرئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی حزبی (هیواو شۆڕش و ڕزگاری) ئەو کۆڕو کۆمەڵە کوردیانەیە کە نیشانەی کوردایەتییان پێوە دیاربوو، پارتی ببووە میراتگری ئەو گرووپانە.

هەروەها بەمەبەستی گۆڕینی ڕێرەوی سیاسی پارتی و بەستنەوەی بە بیروباوەڕی نەتەوەیی، کە ئامانج و ئاواتی مافە ستراتیژییەکانی نەتەوەکەمانە بۆ دروستکردنی سەرکردایەتییەکی خاوەن بڕواو لێهاتوو و ڕاست و شارەزاو پاک و دوورخستنەوەی ئەو لێپرسراوانەی کەسانی گومانلێکراو و بوودەڵەو هیچ لەباراداا نەبوو. هەروەها بەمەبەستی چەسپاندنی کارو کردەوەی شۆڕشگێڕانەی پێشکەوتووخوازی نەتەوەیی لەژێر سایەی دەسەڵاتیدا زەحمەتکێش و چەوساوەو ڕۆشنبیرو قوتابی و جوتیارو هەموو دەستەوبەرەیەکی کورد هێزو تواناو لێهاتنیان یەکخەن. ئەم

ڕاستییانە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە بەجێیانە بوو کە ڕوونمانکردەوە.

لە سەرەتای دروستبوونی شۆڕشەوە نەتەوەییەکان چ لە ڕیزی پارتی، چ لە دەرەوەی پارتیدا، هەر لە دەربەندی بازیان و دوکان و مەرگە و دەربەندیخان هاوکارییان کرد. بەندە (لە دەربەندیخان و بازیان لەگەڵ ئەحمەدی دادی و حاجی براهیم چەرمەگاو مەحمودی فقی محەمەد) ئامادە بوو لەگەڵ چەند ئەندامێکی کوردە نەتەوەییەکانی پارتی لە گەرمکردنی شۆڕش و کۆکردنەوەی هاوبیرانمان لەدەوری شۆڕش، هاوکات لە لایەکی ترەوە، بەهۆی سکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستان/ ئەحمەد تۆفیق نزیکبوونەوەمان لە (بارزانی) هاوکاریمان بۆ کارو چالاکی لەناو پێشمەرگەو پارتیدا دروستبوو.

جگە لە بەشداریی ئێمەو هاوبیرانمان لە ڕێگای نووسراو و وتارەکانمان لە (چرای کوردستان)و چاپکراوە ڕۆشنبیرەکانی (کاژیک)، بەتایبەتی (کاژیکنامە) ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە هاندان و پشتگیری شۆڕش و بەشدارییان تێدا، وەکو هۆنراوەو نووسینەکانی هاوبیرانم (هەردی، کامل ژیرو عەبدوڵڵا جەوهەر، شێرکۆ فایەق بێکەس، فەرەیدون عەلی ئەمین)، لە هەمانکاتدا زۆربەی پێشمەرگەکانی بەشێک لە هێزەکانی خەبات مامۆستا (فەتاح حەمەئەمین ئاغا نۆرەک، نوری حەمە عەلی) بەرپرسی بوون، هەموو گۆشکراوی ئەو ڕێڕەوە سیاسییەی ئێمە بوون و ڕۆڵی گرنگیان هەبوو لە بەهێزکردنی شۆڕش.

ناساندنی داگیرکەرو پشتبەستن بە هێزو توانای کوردو پاڵدان بە شاخەکانی کوردستانەوە، سەرمەشقی ڕاهێنان و تێگەیاندنی

کورد بوون، هاوکات لە نووسراوەکاندا ئاماژەی پێدەدرا، چونکە ڕێگا نیشاندەرو ڕوونکەرەوەی شەڕی پارتیزانی و چۆنییەتی هێرشبردنەکان و بەرگریکردن لەدژی دووژمندا بەتەواوی شیکرابوونەوە. چارەسەری کەموکورتی دوورکەوتنەوە لە هەڵەو ئەزموون وەرگرتن لە بەسەرهاتەکانی کوردو نەتەوەکانی دنیا، ڕێگای شۆڕشگێڕانەی ڕووندەکردەوە. بەهێزکردنی گیانی بڕوا بەخۆبوون و هەوڵ و خەبات بۆ بەرژەوەندیی گشتی، کە ئەمانە هەمووی لە نووسینەکانی نووسراوە نەتەوەییەکان بەڕوونی ئاماژەی پێدەدرا، بەتایبەتی هاندانی کورد بۆ یارمەتی شۆڕش بە هەرجۆرێک بێت مانای پەرەسەندنی گیانی نیشتمانپەروەریی نەتەوەییە.

ئەگەر نەتەوەییەکان بیانویستایە لەسەر شانی بیروباوەڕو ڕێڕەوی سیاسی خۆیان لێپرسراوێتی و دەسەڵات وەرگرن لە شۆڕشدا، ئەوا زۆر کارێکی ئاسان بوو، بەتایبەتی پاش دووبەرەکییەکەی نێوان بارزانی و پارتی لە ساڵی ١٩٦٤دا، چونکە پارتی بەجورێک لاواز ببوو، کە هیوای هەڵسانەوەی لە ناوچەی سلێمانیدا لەدەست دابوو، بەندە ڕۆڵێکی کاریگەرمان نواند بۆ ڕێکخستنەوەی پارتی لەسەر داوای بارەگای بارزانی لەپاش سەردانیکردنم بۆ خزمەت بارزانی و کاک ئیدریس، کە داوای یارمەتییان لە کاژیک و نەتەوەییەکان کرد بۆ دروستکردنەوەی هەیکەلێتی پارتی، ئێمەش داواکەی بارزانیمان جێبەجێ کرد، لەبەرئەوەی بەرەی جەلالییەکان دژایەتی کوردایەتی و نەتەوەییەکانی بەئاشکرا دەکرد، هەرچەندە بەداخەوە بارەگای بارزانی ڕێزیان لەو کارانەی بەندەو نەتەوەییەکان نەگرت، لەدوای

هەڵسانەوەی پارتی کەوتنە دژایەتی نەتەوەییەکان، باشترین بەڵگە دژایەتی کۆنگرەی شەش و کۆنفراسی لقی چواری ساڵی ۱۹۷۰ بوو، کە پێشتر بەدرێژیی باسمان کرد. تەنانەت ڕێگای بە هەندێ کەس و کۆمەڵێکی سەربەخۆ یان لە بەرەی کوردایەتی دەدراو هاوکاری دەکرا بۆ دروستکردنی هێزی سەربازی و کارکردن لە دەسەڵاتەکانی شۆڕش و پارتی و پێشمەرگەدا، بەمەرجێک لەژێر سایەی بارزانیداو لەژێر چاودێریی شۆڕشدا بن. نەتەوەییەکان بۆیان ڕوونبووەوە کە ئەو بارودۆخە ئاڵۆزەی شۆڕش تێیکەوتووە بەهۆی دەستتێوەردانی زۆر بەرەو خاوەن بەرژەوەندی جیاجیا بووە. زۆر بەزەحمەت دەتوانرا ئەو بارودۆخە ئاڵۆزە ڕاستبکرێتەوە، تەنانەت جۆرەها دامودەزگاو کەسانی تری هەڵپەرست و سەر بە دامودەزگاکانی (موخابەراتی) بێگانە کاربەدەست بوون و کاسەلێس و کەسانی بێ بیروباوەڕ لە جموجۆڵدا بوون بۆ سودی تایبەتی و گیرفان.

تەنانەت نەتەوەییەکان نەیاندەتوانی بە ئازادی لە شارو شارۆچکەکانی ئێراندا دانیشن و بگەڕێن و چاودێریی ورد دەکران، لە زۆرکات دەستگیر دەکران و دەشاردرانەوە، وەکو گرتنی (ئەحمەد هەردی)، دەرکردنی بڕیاری گرتنی بەندە، کە لە ڕێگەی هاوڕێی خۆشەویستم (محەمەد ڕەحیم، کە ناسراوە بە هەڤاڵ جوجەڵە) بەرپرسی (پاراستن)ی پارتی بوو ئاگاداری کردم کە دەزگای ساواک بەشوێنماندا دەگەڕێن تا دەستگیرمان بکەن.

باری شۆڕش ئەوەندە ئاڵۆز بوو، زۆر ئەستەم بوو هیچ دەسەڵاتێک بتوانێت لەو بارودۆخەدا دەربچێت و خۆی ڕزگار بکات،

چونکە بەرەڵڵایی و بێ بڕوایی و زۆربوونی پیاوانی بێگانە بەئاشکرا دەبینراو شانازیکردن بە نزیکبوونەوە لە (ساواک) وایکردبوو بەهیچ هێزو بیروباوەڕێک ڕاست نەکرێتەوە. لەبەرئەوە نەتەوەییەکان وەکو هەموو پێشمەرگەو کوردێکی تری ناو شۆڕش دەستەوەسان نەبوون لە خزمەتکردن تا وەستاندنی شەڕو ڕێککەوتنامەی جەزائیر پشتی شۆڕش و بارزانی و پێشمەرگەیان بەرنەدا، عاشقانە بە کوردو کوردستان خەباتیان دەکردو لەو ڕێگەیەدا قوربانییان دا بەگوێرەی هێزو توانایان.

**تێبینی:**

ئەم نووسینە کورتکراوەیەکی نووسنێکی دووردرێژە، بەتایبەتی لە باسی دروستکردنی گرۆ و ڕێکخستنە نەتەوەییەکان، ئەگەر خوا یاربێت و تەمەن باقی بێت، بە چاپێکی تایبەتی بیرۆکەو پاڵنەرەکانی دروستبوونی (لاوانی نەتەوەیی و قوتابیان، پارتی گەلی کورد، کاژیک، پاسۆک) دەنووسین و چاپی دەکەین.

**لەناخی دڵ و دەروونەوە**

(لەبیرمان ناچێتەوە ڕەوابینی داگیرکەر بە ئاغاو لە خانەو بەرەی باوباپیرانماندا کەلەبەرێکی گەورەی خستووەتە پەرژینی باخی نەتەوایەتیمان، کە بووەتە داخێکی گەورەو نراوە بە دڵی هەموو کوردێکەوە).

(سەرچاوەی هەموو جوڵانەوەیەک بیروباوەڕە، جوڵاندنەوەی

بێ بیروباوەڕی دەست و پێ شکاو هەمیشە بێ ئامانجە... جوڵانەوە دەبێت لە بەرگی چست و چالاکیدا بێتە مەیدانی کارو کردەوەو تاقیکردنەوە، بەڵام جوڵانەوەی بێ باوەڕ لە داچڵەکاندن زیاتر هەنگاوی پێ نانرێت).

(ئەو بیروباوەڕەی کە ترسی چوونە مەیدانی لێبکرێت و هەر لە خۆپێچانەوە ترسی هەبێت و خۆی بخاتە قاوغی ڕەق و تەقەوە هەرگیز تۆزی ئەو ڕۆژەی لێهەڵناسێت کە دانیشتووانی کوردستان بەتەمای هەن).

(تێکۆشان کە پێی نایە مەیدانەوە ڕاستییەتی بنجداکوتان و توانای بەرگەگرتنی باوەڕ دەردەخات و قاڵی دەکا بۆ دوورکەوتنەوە، کە هەموو جۆرە وەیشوومەیەک لە تاقیکردنەوەی ڕۆژانی تێکۆشانی لە قاڵبی ڕاستەقینەی خۆیدا توندوتوڵ و چەسپیوتر دەکات).

(کورد دوای هەموو سەرکەوتنێکی بێگانە دەکەوێت و بەدەنگییەوە دەچێت، بەڵام لە دواکەوتنی سەرکەوتنی خۆماڵی دوودڵە، چونکە پێیوایە کە گوێرەکەی خۆماڵی بە گا نابینێت).

(هەڵکەوتوو بەپێی سەرکەوتنی دەپێورێت، ئەوەی ئەمڕۆ تیرو توانجی تێدەگرێت، سبەینێ لە سەرکەوتنا دەبێتە مایەی شانازی پێوەکردن و خۆبەختکردن لەپێناویدا).

(نە کەس هەر بە نان دەژی، نە تەنها تێربوونیش بە مرۆڤایەتی ناو دەبرێت، ئەگەر هەست بەدادپەرستی و ڕووسوری لەگەڵا نەبێت).

(ڕژێمی سیاسی وەک کاڵای بازرگانی لەدەرەوە ناهێنرێت،

دەبێت لەناو جەرگەی سودی نەتەوەو خاکەوە دەربهێنرێت).

(کورد ناتوانێت هەڵسێتە سەر پێ و هەنگاو بنێت بۆ پێشەوە، لەبەر تیشکی ڕۆشناییەک نەبێت کە لە کوردستاندا کڵپەی سەندبێت و بەگوێرەی لێکدانەوەی ناو کوردەواری خۆی نەبێت. ئەو ڕۆشناییەش بڕوای کوردایەتییە).

(یەکێتیی زمان و مێژوو تێکەڵاوی بیرەوەریی و سەرەتای بڕواکردنە بە یەکێتیی نەتەوە).

(زمانی پاراستنی هەر نەتەوەیەک لەو دیلە دەچێت، کە کلیلی بەندیخانەکەی بەخۆی بێت).

(کوردایەتی بناغەی خۆشەویستییە... بەرهەڵستی بە چۆکدانە دژی کردەوەی نیوەو نیوەچڵ بۆ برایەتی و ئاسایش و ئاشنایەتی و دیموکراتی و سۆشیالیستی بە عارەق و ڕەنجی ناوچەوانی کورد هاتووەتە مەیدان).

(سەربەستی دەبێت هاوڕێی پلان و ئامانجێک بێت، سەربەستی دەستبەرداربوونە لە سوودی تایبەتی و خۆبەستنەوەیە بە کارو کردەوەی گشتی و چاکە. دوورکەوتنەوەیە لە خۆبەدەستەوەدان و نائومێدیی).

(کوردایەتی مانای پێشەوەبردنی ژیانە. خواستی بەرەوپێشەوە چونێتی هەر لە زاڵبوونایە).

(چەند شانازییە لەسەنگەری کوردایەتیدا بیت. هەرچی گوللەی ڕۆژانی ڕابردوو هەیە تا ئەمڕۆ بینێ بە ناوچەوانی داگیرکەرانی کوردستانەوە بۆ سبەینێ ڕزگاری و سەربەستی و یەکگرتنەوەی کوردستان).

**(لێکدانەوەی کوردانەی ئەمڕۆمان بۆ دوارۆژێکی ڕۆشن لەباوەشدایە).**

(نەتەوەی کوردمان کە ژێردەستەیە، ئەگەر مێژووی خۆی لەبیرکردایە سست و سڕ دەبێت، بەڵام نامرێت تا زمانی لە دەمدا بێت، ئەگەر زمانی زگماکی لەدەست دا ئەوە دەچێتە ڕیزی مردووانەوە).

(لە ئایین دووان لە مەیدانی کاروباری سیاسیدا گەوجییە، چونکە لەوە تیژترو بەکارترە، چەک نادرێتە دەست دوژمن).

(ئەگەر کوردایەتیمان وەکو بیروباوەڕێک نەچووبێتە مۆخ و دەمارەکانمان، بەتەواوی سەرکەوتن مسۆگەر ناکەین).

(هەر بزووتنەوەیەکی کوردی لەپاڵ بیروباوەڕی نەتەوەیی شۆڕشگێڕی کوردایەتیدا جۆش نەدرێت، دەبێت دەستەوئەژنۆو دۆشداماو بێت لە ڕێڕەوی خەباتدا).

(ئەوەی ئەمڕۆ ڕوودەدا لە کوردەواریدا، ئاوێنەی ڕاستەقینەی وتوویژی ڕۆژانی ڕابردووی پووچبوونەوەیە).

(هەموو وریابوونەوەیەکی نەتەوایەتیمان لەپێدا هەڵشاخێنی ڕەنگ و ڕووی مرومۆچی ئەو ڕۆژە پەیدا دەبێت کە تێیدا تەنگەتاو دەکرێت).

(هیچ کەموکورییەک ڕاست نەکراوەتەوە، هیچ پێشکەوتنێک سەری نەگرتووە، هیچ ڕاپەڕینێک پێک نەهاتووە، هیچ بیروباوەڕێک بڵاونەبووتەوەو نەچەسپیوە، تا لە چوارچێوەی پێشنیارێک لە تەلی بیرکردنەوەی چەند دڵسۆزێکی نەدابێت، چاکی کارگوزاری پێ هەڵنەکردبن و ئومێدی پەنگخواردووی مێشک و دڵ و دەروونیان

پێ بەرنەدابێتەوە تا لە مەیدانی خۆبەختکردنەوە).

(دوورکەوتنەوەو بنەبڕکردنی ناکۆکی ناوخۆ، مانای بەرگەگرتنی هەموو دوژمن و داگیرکەرێک، مانای داکوتانی شارێگەی نەتەوایەتیمانە، مانای نزیکبوونەوەو دەرچوونە لە دیلێتی).

(سەرگەردانییان لە بەشبەشکردنی کوردستاندایە، ئێمەش بەدیار پەندی حیزو سەلامەتیەوە دانیشتووین).

(بەختیاری کورد لە شۆڕش بەرپاکردندایە بە بڕوای نەتەوەیمان بۆ سەندنەوەی ئابڕووی نەتەوەیی و سەربەخۆیی و یەکگرتنەوەی کوردو کوردستان).

(بوودەڵەیی و کونێتی هەر کوردێک وا لە خۆبەستنەوەو خۆهەڵواسینی بە بڕوای بێگانەپەرستی و دوژمن و داگیرکەرەوەیە. هەروەها زرنگی و پیاوەتی لە ناسینەوەی نیشتمان و نەتەوەکەیایەتی).

(لە کوردستان لەدایک بووین بە ئاووهەوای ئەویش نەشونمامان کردووەو پێی گەیشتووین. کەواتە با لە ڕێگەی ئەودا فیداکاربین).

(کوردستان لە پێخەفی سەرەمەرگا ئەم لاشەی بێنازی پارچە پارچەو گلۆڵە بووە بانگمان دەکات بۆ ڕاستکردنەوەو یەکگرتنەوەی. کوردایەتی ئاگری جۆشخواردووی ژیلەمۆی دڵ و دەروونی کوردو کوردستانە. بانگمان دەکات بۆ سەربەخۆیی و ئازادکردنی. ئەم ئامانجانە چاوگێکن بۆ ڕووناککردنەوەی دڵ و دەروونمان).

(بە لەسێدارەدانی کوردپەروەران بە ئاهو هەناسەی ئەوانە لەبن سێدارەکانی داگیرکەرانی کوردستان، ڕۆژی سەرفرازی کوردە، یەکگرتنەوەی نزیک دەبێتەوە).

(ئەو خوورەوشت و بیروباوەڕانەی ئەمڕۆ یەکیانگرتووە، ڕەوانی پاکی ئێمەی لێهاتووەتە بەرهەم، چەپکە گوڵی دەستی شەهیدان و لەسێدارەدانی کوردە بەئێمەیان سپاردووە).

(نزرگەی پیاوانی بێگانە لە کوردستاندا نیشانەی کۆیلەبوونمان پێوە دیارە، زیاتر لووتمان ئەچوزێنێتەوە بۆ تەخت و بەختی لەدەستچووی باووباپیرانمان).

(جیرەو تەقەی پۆستاڵی ئەفسەرو سەربازانی ئەمڕۆی داگیرکەرانی کوردستان لەگەڵ هەر هەنگاوێکیاندا پاژنەی پێیان داگرتنێکە بۆ سەر سنگی هەموو کوردێکی ئەم کوردستانە).

## من و پاسۆک

سەرەتا ناوەڕۆکی ئەم کتێبە بریتییە لە ڕووداوەکانی قۆناغی شۆڕشەکانی کورد، بەتایبەتی شۆڕشی ئەیلوول تا دەگات بە ساڵی ١٩٧٨، بەڵام بەهۆی لەناوچوونی کتێبەکەو جارێکی تر نووسینەوەی لە ساڵی ١٩٨٨- ١٩٨٩و ڕوودانی کۆمەڵێک بابەتی سیاسی تر لەدوای ئەو ساڵەی کە کتێبەکەی تێدا نووسراوە، واتا دوای ساڵی ١٩٧٨ بەپێویستم زانی بابەتەکانی ئەو زەمەنە تێکەڵی بابەتەکانی پێشتری نەکەم و لە چوارچێوەی کتێبێکی جیاوازدا بەوردیی باسی بکەم، بۆئەوەی دەست بخەینە سەر هەموو هۆکارو پاڵنەرەکانی ڕووداوە سیاسییەکان، بەتایبەتی لەم خاڵانەی لای خوارەوە کۆیان دەکەمەوە.

١. دروستبوونی پارتی سۆشیالیستی کورد (پاسۆک) هۆکارو پاڵنەرەکانی.

٢. ڕۆڵی سیاسی و سەربازییان لەدوای تێکچوونی شۆڕشی ئەیلوول و هەڵگیرسانەوەی شۆڕش.

٣. هەوڵێکی تری دروستکردنەوەی گرۆیەکی نەتەوەیی لەدوای تێکچوونی شۆڕش لەلایەن بەندە (جەلالی حاجی حسێن).

٤. پەیوەندیکردنم بە پاسۆک بەرپرسیارێتی (لقی سلێمانی)، پاسۆک تا مانگی ١٢ی ساڵی ١٩٨٩.

٥. بەستنی کۆنفراسی سلێمانی لەلایەن بەندەو دەستەی لقی سلێمانی پاسۆک سەرەتای دروستبوونی کێشەکان.

٦. تێکچوونی پەیوەندییەکانی بەندە لەگەڵ سەرکردایەتیی پاسۆک لە نۆکان ساڵی ١٩٨٩.

٧. بەشێوەیەکی سەرەتایی بۆ بەرچاوڕوونی خوێنەران، بەندە لەگەڵ (پاسۆک)دا لە ساڵی (١٩٧٦-١٩٧٧) لەلایەن خوالێخۆشبوو (ئازاد مستەفا) بە نامەیەک ئاگادار کرام کە بۆچوونی خۆم لەسەر (بەیاننامەی ساڵی ١٩٧٥) دەرببڕم لەسەر شێوازی کارکردنی (پاسۆک)و داوای لێکردم بۆ کارکردن. نامەکە لە ڕێگەی خوالێخوشبوو (مولازم محەمەد شەوقی)یەوە نێدرابوو، منیش وەڵامی تەواوم بەهەمان هاوبیردا ناردەوە.

٨. لە ساڵی ١٩٧٧ بۆ ساڵی ١٩٧٨ پەیوەندیم بە کاک (جەلالی حاجی حسێن) کرد بۆ دروستکردنی گرۆیەکی نەتەوەیی لەدوای وەستاندنی کاری (کاژیک).

٩. ساڵی ١٩٨٥-١٩٨٦ جوانەمەرگ (ئازاد مستەفا)و (مولازم کەریم شێخ سەلام، مولازم شوان)، پەیوەندییان پێوە کردم بۆ گەڕانەوەم بۆ ناو پاسۆک. لەپاش چەند کۆبوونەوەیەک لە سەقزو

نۆکان لە بارەگای سەرکردایەتیی پاسۆکدا کرام بە بەرپرسی لقی سلێمانی (پاسۆک) مانگی ١٢ی ساڵی ١٩٨٩.

بەستنی کۆنفراسێکی (لقی سلێمانی پاسۆک)و ڕەخنەگرتن لە کارەکانی سەرکردایەتیی پاسۆک لە نۆکان، ئەنجامی ئەم کۆنفڕاسەو هاوکات کێشەکانی سەرکردایەتی لەگەڵ مامۆستا (ئەحمەد هەردی) بوو بەهۆی تێکچوونی نێوانی بەندەو سەرکردایەتی بەشێوەیەکی فراوان.

ئەمانەی لای سەرەوە تەنها بۆ بەرچاوڕوونی خوێنەران بوو، تا نووسینی هەموو ئەم ڕووداوانە لە چوارچێوەی کتێبێکی جیاوازدا بۆ خوێنەری کورد، کوردستانێکی ئازاد- گەلێکی یەکسان.



سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:

- عێراق لە دەوری احتلال و انتداب.
- مشکلە الموصل.
- اربعە قرون فی تاریخ العراق الحدیث (چوار سەدە لە مێژووی عێراقی تازە).
- نووسراوەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان .
- نووسراوەکانی حیزبی شیوعیی عێراق.
- نووسراوەکانی (لاوانی نەتەوەیی و قوتابیانی نەتەوەیی و کاژیک، پارتی گەلی).
- پەڕاوی بارزان المضلومة.
- عەرەب و کوردو تورک (ئەدمونس).
- چیرۆکی کوردەکان.
- نووسراوەکانی ماهر نعمان، کنعانیون وزارەتی اعلام عیراق.



شەهید تۆفیق نوری بەگ - زەردەشت و زرنگی کوڕی



٢٩-٤-١٩٦٧ کۆبوونەوەیەکی حزبی پارتی دیموکراتی کوردستان لە هەڵەبجە



بارەگای پارتی گەلی دیموکرتی کوردستان لقی سلیمانی



کۆبوونەوەی پارێزگاری سلێمانی ئەوکات لەگەڵ نوێنەرانی پارتی لە سلێمانی



دەستەی یەکێتی قوتابیان و لاوانی نەتەوەیی کورد کە لەمانە پێکهاتوون

لەراستەوە: عەبدوڵا ئەحمەد - شەهید تۆفیق نوری بەگ - شێخ محەمەدی هەرسین

محەمەد مەجید ئەرسەلان - حەمە عەلی فەرەج



شەهید تۆفیق نوری بەگ



لە راستەوە مستەفا بارزانی- شەهید ئەحمەد عەبدوڵا

سکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران



شەهید تۆفیق نوری بەگ - عەبدوڵا ئاگرین



لەراستەوە: جیهان عومەری چیرۆک نووس - شەهید تۆفیق نوری بەگ



لەگەڵ ژمارەیەک لە گەنج و منداڵان لە باخی گشتی سلێمانی



لەراستەوە: نەوروز مەلا عەلی ئەندامی ناوچە سلێمانی پارتی، کامیل محەمەد ئەمین سەراج ئەندامی ناوچەی سلێمانی پارتی، شەهید توفیق نوری بەگ بەرپرسی ناوچەی سلێمانی پارتی خوالێخووشبوو ڕەسول مامەند سکرتێری حیزبی سۆشیالیستی کوردستان (حسک) شەهید محەمەد ڕەحیم (خاڵە حاجی) ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی سوشیالستی کوردستان شێخ سەلاح شێخلی بەرپرسی لیژنەی ناوچەی قەرەداخی پارتی



لە راستەوە: شەهید تۆفیق نوری بەگ و نوری شێخ کەریم



ئەم وێنەیە لەکاتی سەیران بووە تەنیا ئەوەی ناوەڕاست ناسراوە

کە شەهید نوری حەمە عەلی و شەهید تۆفیق نوری بەگ



لقی سلێمانی پارتی سۆشیالیستی کورد - پاسۆک

لە راستەوە: غاندی توفی- حەمە هێمن - شەهید تۆفیق نوری بەگ - مامۆستا هادی



لەراستەوە: محەمەدی کوێخا حەسەن - سەید وەلی - شیخ خالید - شەهید تۆفیق نوری بەگ
شێنێ فایەق گوڵپی - د. فایەق گوڵپی - رەزای حاجی خدر - بەکری خانم



لەراستەوە: کامیل محەمەد امین سەراج ،شەهید توفیق نوری بەگ،نەوروز مەلاعەلی، نەزانراوە
دانیشتوکان: سەردارحەوێز ئاغا ڕەواندوزی،خوالێخووش بوو عومەر شەمەیی، عارف تەیفوور، خوالێخووش بوو فەرهاد عەبدول حەمید



لەراستەوە: مدنالی عومەر نەغەدەیی - عومەر نەغەدەیی
شەهید تۆفیق نوری بەگ- زانا تۆفیق نوری بەگ



لەراستەوە: رەزای حاجی خدر - شەهید سامی عەبدولرحمان - شەهید تۆفیق نوری بەگ



لە راستەوە: شەهید سامی عەبدولرەحمان - شەهید تۆفیق نوری بەگ



لەراستەوە: رەزای حاجی خدر - عومەری سابیرە سور - نەزرانراوە - گورونی سابیرە سور

نمایدەی پاسۆک لە شاری سەقز - شەهید تۆفیق نوری بەگ



لەراستەوە: شەهید سامی عەبدولرەحمان و شەهید تۆفیق نوری بەگ

- هەربزوتنەوەیەکی کوردی لەپاڵ بیروباوەڕی نەتەوەیی شۆڕشگێری کوردایەتیدا جۆش نەدرێت دەبێت دەستەوئەژنۆ و دۆشداماو بێت لە ڕێڕەوی خەباتدا.

- هیچ کەموکورییەک ڕاست نەکراوەتەوە، هیچ پێشکەوتنێک سەری نەگرتووە هیچ ڕاپەڕینێک پێکنەهاتووە تا لە چوارچێوەی پێشنیارێک لە تەلی بیرکردنەوەی چەند دڵسۆزێکی نەدابێت.





١٩٩١/١٢/١٩

[illegible] کاک تۆفیق [illegible]

سڵاوێکی گەرم

[illegible]

[illegible] ئاگاداریان کردم کە [illegible]

[illegible] منیش زۆر خۆشحاڵ دەبم

[illegible]

[illegible]

هەر شاد و سەرکەوتوو بن

[illegible]